# نووسەرانی بوێر و ئازا

چەند وردە بابەتێک لە زمانی تورکییەوە

**نازم حیکمەت، یەشار کەمال**
**عەزیز نەسین**

وەرگێڕانی: شوکور مستەفا

ناوی کتێب: نووسەرانی بوێر و ئازا
نووسینی: نازم حیکمەت، یەشار کەمال، عەزیز نەسین
وەرگێڕانی: شوکور مستەفا
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٩٩٢
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: ناسیح ساڵح
چاپی یەکەم، هەولێر – ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢٦٠ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

## پێڕست

# هونەری نازم حیکمەت

ئەکبەر بابایێف

ژوورەکەی نازم حیکمەت، تابلۆی (هێرشەکەی) عابدین دینۆ بەدیوارەکانەوە، فۆتۆگرافە ڕەنگاوڕەنگەکەی ئەستەموڵ، (ئەسپەکانی عەونی)، دیارییەکەی پێشەنگەکانی بولگارستان: قالیچەیەکی نەخشین وێنەیەکی زۆر جوانی، زۆر گەورە، کوتومت لە نازم حیکمەت دەچوو بەقالیچەکەوە.

لەسەر مێزەکەی نازم، بەتایپەکەی نازم، پێشەکییەک بۆ کتێبەکەی نازم دەنووسم، بەو قەڵەمەی نازم پێی بەخشیبووم هەڵە ڕاست دەکەمەوە.

نازم لەبارەی پۆشکین، شاعیری گەورەی ڕووسەوە وای نووسیوە:

«پۆشکینم بەسینەما، بەشانۆ دیت، چەندین کتێبم، چەندین بیۆگرافیم لەبارەی پۆشکینەوە خوێندەوە و لە هەموو جارێکیاندا دڵم هاتە سەر لێوانم، دەمگوت ئامان هەر ئێستا خۆی بەکوشت دەدا و لە هەموو جارێکیاندا هەستم بەخەم و پەژارەیەکی سامناک دەکرد و دەمگوت پۆشکین مرد».

سێزدە ساڵی ڕەبەق هاوڕێتییەکی زۆر نزیکم لەگەڵ نازمدا گوزەراند. هەموو شیعرەکانیم لە زمانی خۆیەوە بیست، بووم بەیەکەم خوێنەری ئەو شیعرانەی کە لە مۆسکۆ نووسرابوون، لە بیست و نۆی حوزەیرانی ١٩٥١دا لە (ڤۆگۆڤۆ) فرۆکەخانەی مۆسکۆدا بەپیرییەوە چووم و لە سێی حوزەیرانی ١٩٦٣دا لە (نۆڤۆدیڤیچیە) گۆڕستانی مۆسکۆداماڵئاواییم لێی کرد.

جا ئێستا، کە ئەم پێشەکییە دەنووسم، ئەو ١٣ ساڵە زەق و زۆپ لە پێش چاوم زیندوو دەبنەوە و هەرکە لە ٣ی حوزەیرانی ١٩٦٣ نزیک دەبمەوە دڵم دێتە سەر لێوانم: ئامان نازم دەڕوا و خەم و پەژارەیەکی زۆر بەسام دام دەگرێ.

– «نازم بەم دنیایەدا تێ پەڕی»، «والا نوورەدین، هاوڕێی منداڵی و لاوێتیی نازم ئەم نەخشە نووسینەی بۆ کێلەکەی دانابوو: نازم بەم دنیایەدا تێ پەڕی».

نازم حیکمەت نووسینی زۆر و زەبەندەی لەسەر دەرچوو و هەتا دێ زۆرتریشی لەسەر دەردەچێ. لەبارەی هونەرییەوە ڕەخنە و ڕەخنەکارییەکی زۆر بڵاو کرایەوە و هەتا دێ هی تریشی دەربارە بڵاو دەکرێتەوە. بەڵام شتێک هەیە لە هەمووان گرینگتر: ئەویش ئەوەیە کە نازم بەزمانی خۆی لە هونەری خۆی دەدوێ.

نازم حەزی بەوە نەدەکرد بەزاری خۆی لە هونەری خۆی بدوێ. ئێمە بەزۆر و تۆبزی پێشەکیمان بۆ کتێبەکانی پێ دەنووسی، جارێکیان ملی لێ نا پێشەکییەکی ئاوهای نووسی:

«منداڵ بووم ئەگەر لە ئیملا و نووسینەوەی مەشقدا هەڵەم کردبا، دەبوو دەرسەکەم بەلایەنی کەمەوە بیست و پێنج جار نووسیبایەوە و بەو ڕەنگە سزا دەدرام. ئێستاش گرانترین سزا بەلامەوە ئەوەیە کە پێشەکی و سەروتار بۆ کتێبەکانم بنووسمەوە. ئەوە کتێب و ئەوە خوێنەر، زۆرم متمانە بەئەقڵ و هۆشی خوێنەران هەیە. ئەگەر متمانەم پێیان نەبوایە، داوای خوێندنەوەی کتێبەکانمیانم لێ نەدەکردن، کەواتا چ پێداویستییەک بەپێشەکیی من هەیە؟ من هونەر شێلە تێ دەگەم، یا بێلە تێ دەگەم مانای چییە؟ نیگای هونەرم، ئەم نیگایە چۆن نەشونما و گەشەی کردووە، بەر چ جۆرە گۆڕان و هەڵسوکەوتێک کەوتووە، چەند نووسینێکی هەڵبژاردەی وا بەلای خوێنەری کتێبەکانمەوە ڕوون و ئاشکرا نەبێ هەرچییەکی بیکەم پووچ و بێ مایەیە، بەڵام سەرەڕای ئەم قسانەش پێشەکی هەر دەنووسم، لچ و لێوی خۆم دەکرۆژم، نێوچاوانم کرژ دەکەم. هەڵدەستم، دادەنیشمەوە، بەڵام هەر دەشنووسم. لەبەرچی؟ بۆچی؟ بۆ ئەوەی چیم ویستووە بیکەم، چیم توانیوە بیکەم، بەئاواتی چییەوە بووم، چەندم لەمانە توانیوە بەجێ بێنم، دەمەوێ ئەمانە هەموو ڕوون و ئاشکرا بن، واتە نیگای هونەریم، ئەوەی دەمەوێ بیکەم، ئاواتم بەخوێنەران ڕادەگەیەنم. خوێنەر دەڕوانێ ئەوەی کردوومە و ئەوەی توانیومە بیکەم

دەیخوێنێتەوە، دەیانپێوێ، جوداوازی هەبێ دەیبینێ. هەڵبەت هەیە. ئاوات و عەزرەتمان گەلێ لە نوای ئەوانەوەن کە توانیومانە جێبەجێیان بکەین و گەلێ گەورەترن. جیاوازی هەیە، بەڵام دژایەتی نییە. من تاکە دێرێکم دژی نیگای هونەریم نەنووسی، تێش کۆشام قەت نەنووسم».

لە پاشان نازم چەند جارێکی تریش لەم بابەتە پێشەکییانەی نووسی. بەڵام ئەوەی من مەبەستم بوو – ئەوە بوو کە هیچی وای نەدەنووسی لە هونەرەکەی بدوێ، یا هەر نەیدەویست بنووسێ. هەمووشی هەر سەبارەت بەو هۆیانەی سەرەوە.

ڕۆژێکیان لە ئیتاڵیاوە، لەو دەزگایەوەی کە کتێبەکانی نازمی لە چاپ دەدا نامەیەک هات… خاوەن دەزگاکە نووسیبووی بەتەمایە هەموو کتێبەکانی نازم، هەرچی تا ئێستا نووسیویە با چەند بەرگیش بێ لە چاپ بدا و داوای ئەوەشی لێ کردبوو کە دەربارەی بیروباوەڕی هونەرەکەشی شتێک بنووسێ. ئەوەشمان لە بیر نەچێ ئەم دەزگایە دەزگایەک بوو کتێبەکانی نازمی لە هەموو دەزگاکانی تر چاکتر لە چاپ دەدا و تەنانەت جارێکیان سێیەم کتێبی (دیمەنەکانی مرۆڤ لە وڵاتەکەمەوە)ی بەرانبەر یەک لاپەڕەیەکی بەتورکی و لاپەڕەیەکی بەئیتاڵیایی لە چاپ دابوو. نازم زۆری ڕێز لەو دەزگایە دەگرت و خواستەکەی بەخۆشحاڵییەوە قوبووڵ کرد.

دەستمان بەکۆکردنەوەی ئاسەوارەکانی نازم کرد، بەڵام کارەکە بەنیوەچڵی مایەوە. نازم چوو بۆ تانگانیکا، لە گەڕانەوەیدا بۆ بەرلین، لە پاشان زۆری پێ نەچوو… سێی حوزەیرانی ١٩٦٣.

پێش ئەوەی بۆ تانگانیکا بڕوا وامان بڕیار دا:

من هەرچییەکی لە کاتی جۆربەجۆردا نووسیوە و ئەو نووسینانەی لە کن مێن (مۆنتاج)ێکیان لێ ساز کەم و نازم پاش گەڕانەوەی چاوێکیان پێدا بگێڕێ و هەر جێیەکی پێویستی بەقەڵەم تێوەردان بوو تێی وەردا و بەگوێرەی پێویست (پردیان) لە نێواندا بۆ هەڵبەستێ.

ئەمن (مۆنتاج)ی خۆمم ساز کرد و پێشانی نازمم دا، پەسندی کرد. لەبارەی پردەکانەوە دواین، دەبوایە پردەکان لە پاش دوو ڕۆژ هەڵبەسترابان...

جا ئەم نووسینەی خوارەوە ئەو مۆنتاجەیە. بەڵام بەداخەوە بەبێ پرد. ویستم پردەکان خۆم هەڵیان بەستم بەمەرجێ ئەوانەی نازم دەیویست بیانکات بەبیر بێنمەوە.

ئیملا ئیملای نازمە، دەسکاریم نەکرد.

«بۆچی شیعر دەنووسم؟ با بەجۆرێکی تر بپرسم ڕاستترە: لەبەرچی و چۆن دەستم بەشیعر نووسین کرد؟» یا بیری خۆمی بێنمەوە.

سێزدە ساڵان بووم. لە ئەستەموڵ بووین. باپیرم شاعیر بوو، بەڵام تا ئێستاش لە شیعرەکانی ناگەم. بەشێوەی عوسمانلی شیعری دەنووسی. لە سەدا حەفتا و پێنجی وشەکانی عەرەبی و فارسی بوون، تورکیی لەسەر شێوە ڕێزمانی عەرەبی و فارسی دەنووسی، شیعرەکانی شیعری سۆفییانە و بابەتی ئاینی و دیدەکتیکانە (١) و دۆغماتیکانە بوون. تێیان نەدەگەیشتم. بەڵام من نەوەی باپیرێکی شاعیر بووم. دایکم شەیدای لامارتین بوو. بەفەرەنساوی شیعری دەخوێندەوە، جارێکیان، لەو سەردەمەدا شیعرەکانی لامارتین کرابوون بەتورکی، چەند شیعرێکی بەشێوەی عوسمانلی بوو، دایکم فەرەنساویی چاک دەزانی، بەڵام ئەویش وەکو من عوسمانلیی نەدەزانی.

باپیرم، مەولەوی نازم پاشا شاعیر بوو، دایکم شەیدای لامارتین بوو. لە ماڵەوە، سەرەڕای ئەوەی کە باوکم هیچ سەروساختێکی لەگەڵ ئەدەبیاتدا نەبوو، بەڵام شیعر لە سەرووی هەموو شتێکەوە بوو.

ماڵەکەی بەرانبەرمان ئاگری تێ بەربوو. بۆ یەکەم جار بوو چاوم بەئاگرکەوتنەوە دەکەوت. شڵەژام، ترسام. باپیرم بۆ ئەوەی ئاگرەکە بەرەو ماڵی ئێمە نەپەڕێتەوە، قورئانێکی هەڵگرت و بەرەو ڕووی ئاگرەکەی ڕاگرت، ئاگرەکە کوژایەوە. ئاگرەکە هەر لەخۆڕا دامرکایەوە، بەڵام لە پاش چی؟ لە پاش ئەوەی خانووەکەی کرد بەخۆڵەمێش. ئیدی منیش لە دوای سەعاتێ

یەکەم شیعرم بەناوی سوتمانەوە هۆندەوە. شیعرەکەم بەخەیاڵی خۆم لەسەر کێشی عەرووزی هۆندەوە کە زۆر جار باپیرم بەدەنگی بەرز شیعری پێ دەخوێندەوە، هەمیشە لە گوێمدا دەزرینگایەوە منیش لاساییم کردەوە. واتە نەکێشی پەنجەیی بوو و نەعەرووزیش بوو. کێشی سەربەستیش بووبێ، نازانم، لێی بێ خەبەر بووم، شتێک بوو خۆم رێکم خستبوو. زمانەکەشی هەر بەو تەرزە بوو، لاساییی شێوەی عوسمانلیم کردبووەوە بەخەیاڵی خۆم.

شیعرەکەش ئەمەیە:

**دەسووتێ دەسووتێ**

**سامناکانە دەسووتێ چوکڵ و چیوان**

**بۆ باوەشی خۆی رادەکێشێ ئەم**

**دژمنی بەشەرە**

**خانووان، هەژاران، هەتیوان...**

لە کاتێکدا ئەمانە دەنووسم هەستم بەشتێ کرد. تومەزا من لە ژێر تەئسیری ئەدەبیاتی نوێ لە باپیرمەوە و مەسەلا لە ژێر تەئسیری فیکرەتدا بووم. بۆچی؟ نازانم. بگرە سەبارەت بەوە بووبێ کە باوکم هیچ حەزی لە شیعریش نەدەکرد دووجار شیعری تۆفیق فیکرەتی بەدەنگی بەرز – ئەویش بەجۆرە عوسمانلییەکی تایبەتی شیعری دەنووسی – بۆ خوێندبوومەوە؟

بگرە ئەوە بووبێ.

پێم وایە شیعری دووەمم لە چواردە ساڵیدا نووسی. لە گەرمەی شەڕی یەکەمی جیهاندا بووین. خاڵم لە چەناقەلا شەهید بووبوو. تا بڵێی نیشتمانپەروەر بووم. شیعرێکم بۆ شەڕ نووسی چەند سەیرە، زۆر چاک دەزانم نووسیومە، تەنانەت بەشێوەی عوسمانلیشم نەنووسی، بەتورکی ئەو تاک و تەرا شیعرانەی (محەمەد ئەمین)م نووسی کە لە فێرگە دەمانخوێند و وشەی عەرەبی و فارسیی کەم تێدا بوون، بەڵام بەداخەوە یەک دێریم لە بیر نەماوە.

لە پاشان سێیەم شیعرم – هەڵەم نەکردبێ – لە تەمەنی شازدەساڵیدا نووسی، پێم وایە شاعیرێکی گەورەی تورک، (یەحیا کەمال)، کە زمان و بیروباوەڕێکی شیعرییانەی تازەی بۆ ئەو سەردەمە هێنابووە ئاراوە سەوداسەری دایکم بوو. دایکم شیعرەکانی لە ماڵەوە دەخوێندەوە. ئەم شاعیرە لە فێرگەی دەریاوانی مامۆستای مێژووم بوو. ئەوەی نووسیبووم بۆ پشیلەی خوشکەکەمم نووسیبوو. پێشانی یەحیا کەمالم دا، ویستی پشیلەکەش ببینێ، ئەو پشیلەیەی من شیعرم پێدا هەڵگوتبوو زۆری بەپشیلە ڕاستەقینەکە نەچوواند، گوتی: تۆیەک بتوانی بەم پشیلە پیسە گەڕەدا بەم ڕەنگە هەڵبڵێی دەبی بەشاعیر.

لە دەوروبەری تەمەنی حەڤدە ساڵیمدا یەکەم شیعرم بڵاو کرایەوە. شیعرەکە بەناوی (سەروستان)ەکانەوە بوو، واتە بۆ ئەو مردووانەم گوتبوو کە لە ژیاندا تووشی عەشق و دڵداری هاتبوون و لە گۆڕستانەکاندا دەگریان. یەحیا کەمال زۆر شوێنی بۆ ڕاست کردمەوە.

لە پاشان بەسەودای کچانەوە گلام، شیعرم نووسی. دوایی ئیئتیلاف ئەستەمووڵی داگیر کرد، شیعرم لەبارەی ئەوان و ئەوانەی لە ئەنەدۆڵ شەڕیان دەکرد نووسی، ویژدان چییە، نامووس چییە، فلان چییە، بیرم کردەوە، شیعرم نووسی، بەڵام ئیدی زمانم پاراو و ڕەوان بووبوو و بەکێشی پەنجەیی و قافیەی ڕاست و دروست فێری شیعر هۆنینەوە بووم.

پەڕیمەوە بۆ ئەنەدۆڵ. میللەت بەئەسپی لەڕ و لاوازەوە، بەچەکی پاشماوەی حەزرەتی نووحەوە، بەبرسێتی، بەئەسپێ و ڕشکەوە لە دژی لەشکر و ئۆردووی یۆنان دەجەنگی. میللەت و شۆڕشەکەیم بۆ ئاشکرا بوو، پەشۆکام، ترسام، عەشق بووم، بوورامەوە، هەستم کرد پێویستە ئەمانە هەموو بەجۆرێکی تر بنووسمەوە، بەڵام نەمنووسی، هەژانێکی گەورەتری پێ دەوێ.

(ئیتر لەو ڕۆژەوە بێ شیعرنووسین هەڵناکەم).

کاتێ لە ئەستەمووڵی داگیرکراوەوە بەرەو ئەنەدۆڵ بوومەوە، بەتایبەتی کە

گەیشتمە بۆلوو و تێکەڵ بەخەڵک و خوا بووم و لەگەڵ گوندییەکاندا پێوەندیم پتر پەیدا کرد و ئاگا و ڕووداوی ڕووسیای سۆڤیەتیم بەگوێی خۆم دەبیستەوە، هەستم کرد گەلێ شتی تازە هەن هێشتا بەشیعر نەگوتراون و بەپێویستم زانی بیانخەمە نێو چوارچێوەی شیعرەوە. لەم کارەدا لە پێشدا کەوتمە سەر کەڵکەڵەی ئەوە چۆن ڕێبازێکی خۆیی شەکڵێکی تایبەتی خۆمەوە بدۆزمەوە. تازەکاری لە شەکڵدا بەگشتی ساناتر بەدەستەوە دێ، لە قافیەوە دەستم بەکارەکە کرد. قافیەکانم تەنیا لە کۆتاییی دێرەکانەوە دانەنا، یەکیانم لە کۆتاییەوە و ئەوی تریانم لەسەر دێرەکانەوە دانا بۆ نموونە:

**یلدزلر له افقه صارقان بیاض،**

**دوم دوز بر گیجه**

**ساعتلر جر ناصل قوشمق**

**آرەزوسنی ویررسه...**

**لەگەڵ ئەستێرەکاندا شۆڕ بووەتەوە**

**شەوێکی سپی و ڕاست و بێ خەوش**

**چۆن بە سەعاتان ئارەزووی**

**تاودان بدا...**

کە لە بۆلووە هاتمە تەرەبزوون، بەو مەبەستەی بپەرمەوە ڕووسیای سۆڤیەتی، زۆر بەپەرۆشی ڕێبازێکی خۆییەوە بووم. بەڵام ئەم خۆیەتییە، واتە ئەم خۆیەتییەی من بەشۆڕشگێڕانەم لە قەڵەم دەدا، ویستم بەپێوار و ڕەمز و هێمای گشتی بیخەمە ڕوو.

بۆ نموونە:

**ئەی ئەهرامی دەشتە سووتاوە**

**سوورهەڵگەڕاوەکانی میسر**

**ئەمڕۆ ئەو پیاوەی بەزمانی دڵی**

**خۆشی دەوێی بەڵکو دڵ ئازایەکە،**
**بەڵکو شێتێکە.**
**بەڵام سوێندی خواردووە بە**
**هەر جۆرێ بێ بترووخێنێ...**

هاتمە باتووم. پێوەندیم لەگەڵ ریالیزمی سۆڤیەتیدا پەیدا کرد. لەلایەکەوە شیعری لەشکری سوورم نووسی، لەولای دیکەوە دیسان مەسەلەی رێباز و شکڵ سەرومڕ خەریکی کردم. (کتێبی پیرۆزم) بەچواردە پەنجەیی و حەوت پەنجەیی نووسی. ئەم جۆرە ئەزموونانە پێش منیش کرابوون. بەڵام من بۆ یەکەم جار ئەم ئەزموونەم لە شیعرەکانمدا بەکار دەهێنا، لە رۆژنامەی (پراڤدا)، یا (ئێزڤێستیا) دابوو، ئێستا وەبیرم نایەتەوە، بەهەرحاڵ شیعرێکی مایاکۆفسکیم بەرچاو کەوت، کورت و درێژیی دێرەکانی زۆری سەرنج رانەکێشام، بەڵام شیعرەکەم بۆ پێ نەکرا بەتورکی و لە مانا و مەبەستەکەی نەگەیشتم. کاتێ لە باتوومەوە هاتمە مۆسکۆ تخووبی ناوچەی برسێتیم بەزاند. ئەوانەی بەچاوی خۆمم دیتبوون زۆریان کار تێ کردم. بەڵام ویستم بقیڕێنم کە برسێتییەکی وا شۆڕش نارووخێنێ. لە مۆسکۆ ویستم شیعرێک لەسەر کێشی پەنجەیی و بەهەموو ریزە پەنجەیەکانەوە لەبارەی برسێتییەوە بنووسم، بەڵام سەری نەگرت. ئەوساکە شێوە و شکڵی شیعرەکەی باتوومم هاتەوە پێش چاو. سەبارەت بەهەرچییەک بوو قەناعەتم بەوە هێنا کە لەسەر کێشە سەربەستەکانی فەرەنسی نەبوو، بگرە شتێکی نرت و نوێ بوو و شاعیر زۆر جار لە حاڵەتی داڵغەدا وا بیر دەکاتەوە و ئیتر ئەوە بوو شیعری (بیبلەی چاوی برسییەکانم) نووسی.

**هەندێک**
**سوقان**
**بەئەژنۆی خۆیاندا دەکێشن**
**بەسکێکی خڕەوە**

**هەندێک**

**پێست... پێست**

**تەنیا**

**هەر چاویان دەژین**

لەو سـەردەمانەدا پێم وابوو ئەم تەرزە قـافـیـەیە دەورێکی گەورە دەبینێ و بۆ ئەوەی بەسـەر قافیەدا زاڵ بم دەستم بەمەشق و خۆراهێنان کرد. بۆ نموونە:

**ببارە باران ببارە**

**ببارە باران ببارە**

**تۆرەکان بدۆشە**

**هی باوکێتی**

**دیسان چەم وشکاویی هێنا ماسی**

**دەرناچێ...**

هەر لەو کاتەدا قەناعەتم بەوە هێنا کە ئاوازی شیعر تەنیا سازێک، تەنانەت تاکە کـەمـانێک نییـە، بگرە دەبێ ئۆرکێسـتـرایەک بێ بەچەندین ئامـێـری جـۆراوجۆر و چەندین ڕیزی جـوێ جـوێ ئاواز و ئاهەنگی لێـوە بێ، (هونەری نوێ)، (دەریای خەزەر)، (هێشوە بی) ئەم شـیعرانە هەموو لە ڕووی تەکنیکەوە ئەزموون و بەرهەمی ئەم قەناعەتەمە.

لە تەواوی ئەم شکڵکارییانـەدا کرۆک و بنیـچەی شـیـعـرەکان سرشـتـەکانی کێشی پەنجەیی، واتە شێوەی شـیعری فۆلکلۆری میللیمان و هی عەرووزی، واتە ئەدەبیـاتی دیوانی نـەدۆڕاندبوو و هەمـووی دەپاراست. لە قـافـیـەسـازیدا بەرەنگاری هیـچ ئاسـتــەنگێک نەدەهاتم. چونکە ئەدەبیــاتی دیوان ئـەوپەڕی هونەری قافیەسازی و ئیمکاناتەکانی پێ بەخشیبووم و ئەم لایەنەش بەشێک بوو لە داو و دەستوور و عەنعەنات و نەریتم.

شیعرەکانی ئەم سەردەمەم بەتایبەتی بۆ شانۆ یا بۆ خوێندنەوەی بەکۆمەڵ

دەنووسی. هەڵبەت ئەمەش کاری لە شکڵ و شێوە دەکرد. ئەمە نموونەیەکە بۆ ئەوەی بەکۆمەڵ و بەیەک دەنگ خوێندنەوەییم مەبەست بوایە و لەگەڵ تێمپۆی مارشی ڕەوتدا هەڵم دەبەست:

**هەنگاو**

**هەنگاو**

**هەنگاوەکان هەنگاوە-کانی**

**قاڵ-درمە، قاڵ-درمە**

**قاڵ-درمە-کان، قاڵ-درمە-کانی...**

**شەقام**

**شەقامەکان –**

**قەڵەباڵغ**

**قە-ڵە-با-ڵغ**

ئەم هەموو لێتۆژینەوەیە، ئەم هەموو لێکۆڵینەوانە بەدوای گونجاوترین و سازترین شکڵدا بۆ خۆیەتی لە تەئسیری ڕێبازێک یا چەند ڕێبازێکی شیعری ئەو سەردەمەی سۆڤیەت بەدوور نییە.

«مەبەست (لەو سەردەمە)ی کە نازم حیکمەت دەڵێ واتە ساڵەکانی ۱۹۲۰. جا بەڕاستی لەو ساڵانەدا چەند ڕێبازێک لە شیعری سۆڤیەتیدا هەبوون، لە هەموویان گرینگتر «فوتوریزم – ئایندەکاری» بوو کە مایاکۆفسکی سەرۆکایەتیی دەکرد. لەمانە شاعیرە بەناوبانگەکانی وەکو ئیلیاسێلڤنیسکی و ئەدوارد باگریتسکی سەر بە «کۆنستروکتیڤیزم – ئینشائیەت – بنائیەت» بوون. لەو ساڵانەدا کە هێشتا نازم حیکمەت فێری زمانی ڕووسی نەبووبوو مەسەلەکانی شکڵ و شێوە، نەک ناوەڕۆک و خۆیەتی، سەرنجی ڕادەکێشا. نازم حیکمەت شکڵی شیعرەکانی مایاکۆفسکیی پەسند دەکرد و بەو تەرزە (لە ڕووی شکڵەوە) دەستی بەشیعر نووسین کرد و خۆی بە (فوتوریست) دادەنا، بەڵام ڕۆژێکیان تورکێکی ڕووسیزانی، لە کۆڵانێکدا تووش هات پێی گوت:

– ئەرێ تۆ شێتی؟ خۆت بە (فوتوریست) دەزانی، گۆیا تا ئێستا نەتزانیوە کە فوتوریستەکان ئینکاری لیریزم لە شیعردا دەکەن؟

نازمیش دەڵێ:

– هەی نەبێ، کەواتا من فوتوریست نیم، باشە ئەوانەی کە لیریزم ئینکار ناکەن کێن؟

– کۆنستروکتیڤیستەکانن.

– دە کەواتا من کۆنستروکتیڤیستم!

بەڵام کۆنستروکتیڤیستایەتیی نازم زۆری نەخایاندووە.

هەر لە پاش ماوەیەکی کورت، یەکێکی تر بەنازم دەڵێ: ئەوانەی لیریزم لە شیعردا ئینکار دەکەن فوتوریستەکان نین، کۆنستروکتیڤیستەکانن. نازم حیکمەتیش سەرلەنوێ دەبێتەوە بە (فوتوریست).

سەرەڕای ئەوەی کە تەئسیری فوتوریزم و کۆنستروکتیڤیزم لە ڕووی (خۆیەتی – ذاتیە)تەوە لە شیعرەکانی دوایی نازم حیکمەتدا بەدی دەکرا، بۆ نموونە: لە شیعری (هونەر هەڵمەشتندا) – ئەو باڵانەی لەسەر شانی پەری ئیلهامی شیعرمدا کرابوونەوە لە پوترێلە (٢) ئاسنەکانی پردە ئاسنە هەڵواسراوەکانمن، بەڵام ئەم تەئسیرە بەگشتی لە شکڵدایە.

ئەمەش نموونەیەکی تر لە تەئسیری شیعری سۆڤیەتیی ئەو سەردەمە لە نازم حیکمەت، لە ساڵەکانی بیستدا شیعرێک لە مۆسکۆ زۆر باو بوو و دەماودەم بەسەر زاری خەڵکەوە دەگەڕا، شیعرەکە (گرەنادا)ی میخائیل سڤێتلۆف بوو. گرەنادا ناوی شارێکە لە ئیسپانیا. قارەمانی **شیعرەکە** (گرەنادا، گرەنادا) گرەنادا مۆیا! بەگۆرانی دەڵێ و لە ناکاو گوللەیەک لە نێوچاوانی دەدرێ وشەی گرەنادای بۆ تەواو ناکرێ و دەڵێ (گرەنا) و دەمرێ. نازم حیکمەتیش لە مانای شیعرەکە ناگا و وا دەزانێ ئەم وشە بەنیوەچڵی گوتنە و قرتاندنی بەشێکی لە بەشەکەی تری جۆرە هونەربازییەکە و لە شیعرەکانی (هێشوە بی) و (دەریای خەزەر)دا ئەم هونەربازییەی بەکار هێناوە:

**ئەسپ سوارەکان، ئەسپ سوارە**
**کان، ئەسپ سوارەکان**
**ئەسپ سوارە باڵی ئەسپە**
**کانیان با!**
**ئەسپەکانیان باڵیان با...**
**ئەسپەکانیان با.**
**ئەسپەکانیان.**
**ئەسپ...**
(هێشوە بی)
**قایغ بڵند دەبێتەوە**
**قایغ نزم دەبێتەوە**
**قا بڵند دەبێتەوە...**
**قا نزم دەبێتەوە...**
**بڵند...**
**نزم...**
**بڵند...**
(دەریای خەزەر)

لە پاش ماوەیەکی زۆر، لە ١٩٥٢دا کە قسە لەسەر ئەم شیعرانە دەکرا، نازم ئەمانەی گوتبوو:

– هیچ لە شیعرەکانی سڤێتلۆفدا نەتەقیبووەوە، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت نارنجۆکێک دەتەقێتەوە، لە شیعرەکانی منیشدا هیچ نوقم نەبووبوو، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم قایغێک نوقم دەبێ و ئەسپێکیش دەگلێ.

گوتمان:

– ئەوە چ دەڵێی؟ نارنجۆکی چی ئوستاد.

– ئەی گرەناتا نارنجۆک نییە؟

– بەڵێ، نارنجۆکە، بەڵام لە شیعرەکەدا (گرەناتا) نییە (گرەنادا)یە واتە شارێکە لە ئیسپانیا.

– نەباوە! دەک خوا بیبڕێ، چی بکەم، وای تێ گەیشتم، تازە شیعرەکەم نووسیوە.

ئەم نموونەیە، ئەوە پێشان دەدا کە شیعری سۆڤیەتی لە پێش هەموو شتێکدا لە شکڵدا تەئسیری لە نازم حیکمەت کردووە. پێویستە تەئسیری شیعری سۆڤیەتیی ئەو سەردەمە لە پێش هەموو شتێکدا لەو هەوا و بوارەدا منەیی بکەین کە شیعری ئەو سەردەمەی خوڵقاند، لەو ورووژان و هەیەجانەدا منەیی بکەین کە داگیرکردن هێنابوویە گۆڕێ. ئەم ئیحتلالەی کە شیعری باگرێتسکی و سفێتلۆف دەنووسی، بەشاعیری وەکو مایاکۆفسکێ و هەوای شەڕی نیشتمان ن د پ(٣) ئەو شیعرە بەهەیەجانەی بەنازم حیکمەت گوتووە. ناوەڕۆکی شیعری ئەو سەردەمەی سۆڤیەت چ لە شیعرەکانی سۆڤیەتیدا و چ لە شیعرەکانی نازم حیکمەتدا هاوبەشن. نازم حیکمەتێک کە لە خۆیەتییەکی نوێ، لە شەکڵێکی تازە دەگەڕا سوودی لە هەندێ شەکڵی شیعری شاعیرە سۆڤیەتییەکان وەرگرتووە. لە تەئسیرکردنی شیعری سۆڤیەتی لە نازم حیکمەت لەو باوەڕەدام ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە زۆر بەسوودە.

کە بۆ یەکەم جار گەڕامەوە وڵات، لە ١٩٢٥دا، ئەو شیعرانەی، چ لە رووی شەکڵ و چ لە رووی خۆیەتییەوە رووی دەمیان لە جەماوەر و کۆمەڵ دەکرد لە سەرنج ڕاکێشانمدا بەردەوام بوون.

لە نێو شیعرەکانی ئەو سەردەمەدا، شیعرەکانم لە شانۆدا، ڕاستەوخۆ دەتوانی بۆ گوێگرە کرێکارەکان بخوێنمەوە.

گەڕامەوە بۆ مۆسکۆ، لەلایەکەوە ریالیزمی یەکەتیی سۆڤیەت، لەلایەکەوە ڕووداوی مێژووانەی شۆڕشگێڕانەی نێو میللەتان، لەلایەکەوە داخ و حەسرەتی وڵات لە شیعرەکانمدا ڕیزی پێشەوەیان گرت.

بەتایبەتی لە دوای ئەوەی کە بۆ یەکەم جار هاتم بۆ مۆسکۆ گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە شیعر بەبێ سرشتی لیریک، کە جاران نەمدەسەلماند، ناگونجێ.

جا دووبارە گەڕانەوەی سرشتی لیریک بۆ نێو شیعرەکانم بوو بەهۆی نەرمونۆڵی لە شەکڵدا بۆ نموونە:

**دەمەوێ بۆ دەریا بگەڕێمەوە**

**لە ئاوێنەی شینی ئاوەکاندا**

**قووت بخۆمەوە و بینێرم**

**دەمەوێ بۆ دەریا بگەڕێمەوە...**

**دەمەوێ بۆ دەریا بگەڕێمەوە...**

ئەو خەیاڵانەی کە لە ناکاو و کوتوپڕ بۆ مرۆ دێن و وەک بڵێی تایبەت بێ بەجۆری کەسەکەوە بەرەبەرە دایانە کزی و کەمی. با چەند نموونەیەک بۆ ئەو جۆرە خەیاڵانە بخەمە پێش چاو.

بۆ یار:

**ئەی پووانکارەی کراس هاودامانی**

**بێ موو**

یا:

**ئەی، ئەو ژنەی رۆحی قەمەرەی**

**لۆردانە**

یا:

**... من ئەوسا بەختەوەرم**

**کە جووتێ پەروانە بەکلکمەوە**

**ببەستم...**

**تۆربینێکیش لەسەر سکم دانێم**

گەڕامەوە بۆ وڵات، سنوورم بەزاند و نەبەزاند کەوتمە زیندانەوە. تەئسیری

زیندانی هۆرا، لە ڕووی خۆیەتییەوە خۆی لە شیعرمدا نواند. نۆتەکانی زیندانی هۆرا واتە گەیشتن بەبەهرەی وەرگرتنی جۆرە ڕیالیزمێکی تازە. هەرچی شکڵیشە بەو پێودانە بوو بەتەرزە ڕوونکردنەوەیەک، چیرۆک گێڕانەوەیەک. خەیاڵەکانیش نوێ بوونەوە. ئەمە نموونەیەک لە شیعری (بێدەنگی):

**دەرەوە**

**دەڵێی یاخییەکە**

**سورمە بە شەرواڵەکەیەوە**

**دەسووتێ.**

وێڕای ئەوەش، جۆرە ڕووکەشییەک لە ڕووی شکڵەوە هێشتا بەسەر شیعرەکانمدا زاڵ بوو.

بزووتنەوەی پارتەکانی نێو وڵات بەجارێ لە سەدا نەوەت و هەشتی یاساغ بوو. بەڵام ڕێگەی هەندێ بڵاوکردنەوەی قانوونی هەبوون. نەمدەتوانی شیعرەکانم لە شانۆوە بەدەنگی بەرز بۆ کرێکاران بخوێنمەوە، بەڵام دەکرا بەشێوەیەکی قانوونی واتە بەچوونە زیندانەوە لە چاپ بدرابان، ئەم هەڵوێستە تەئسیری هەم لە ناوەڕۆک و هەم لە شکڵی شیعرەکانم کرد.

وێڕای بەکارهێنانی قافیەی توندوتیژ و خەیاڵیی کوتوپڕ و لە ناکاو لە هەندێ شیعری وەکو لە (کەرەم) و هەجووەکانمدا بەدی دەکرێ، لە شارێی خۆیدا، سرشتی لیریک، بەسرشتی دڵداری تێ ناگەم، بەرەبەرە بەهێز بوو، قافیەکان نەرم بوونەوە. دەنگی شاعیر لە ڕووی زمانەوە جا لەگەڵ تاکە کەسێک، یا چەند کەسێکدا بدوێ نزم و هێدی بووەوە. (ئی ریزەکە)، (مردنی ئی ریزەکە)، (ئەو تەلگرافەی شەوێ هات)، (چیرۆکی لێک دابڕانێک)، (خۆشبینی)، (بەشکو من)، (دێوی چاوشین) و... هتد، نموونەی قسەکانمن.

**بەشکو من**

**لەو ڕۆژەوە**

**زۆر لەمێژتر،**

**بەسەر پردەکەوە شۆڕ بوویێتمەوە**

**لە سبەینانێکدا سێبەرەکەم بەر بدەمەوە**

**سەر**

**قیرتاوەکە.**

**بەشکو من**

**لەو ڕۆژەوە**

**زۆر لە پاشتر،**

**لە چەناگەمدا نیشانەی ڕدێنێکی سپی**

یا:

**بەساغی دەمێنم...**

**ئەو دێوێکی چاوشینە.**

**حەزی لە ژنێکی خنجیلانە کرد**

**ژنەکە خەیاڵی لە ماڵێکی چکۆلانە**

**دەکردەوە**

**ماڵێک**

**لە باخچەکەیدا**

**گوڵەبەهارە بپشکوێ...**

ڕووداوەکانی نێو میللەتان جێگەیەکی زۆر گرینگی لە شیعرەکانمدا دەگرت، ئەم شیعرانەم بۆ باری ئەوێ ڕۆژێی وڵات، ناچار بووم جۆرە تەمومژێکی بخەمە سەر. دەنا لە چاپ نەدەدران. هەندێکیان جارجار لە واقیعی تورکیا دەدوا. هەروەکو لە (بۆچی خۆی کوشت)دا بەدیار دەکەوێ. لە هەندێکیاندا ناچار بووم لە ژێر پەردەی سرشتێکی فەنتازیدا بیروباوەڕم دەربڕم.

کەچی هەروەکو لە (ژوکۆند لەگەڵ سی – یا – ئو)دا هەستی پێ دەکرێ. لە

هەندێکیاندا بەئاشکراتر دەمتوانی بنووسم. لەمانە بەتایبەتی دەکرا سرشتی هەجوو گاڵتەوگەپ و جەفەنگ بەکار بێن. هەروەکو لە (نامە بۆ تارانتا بابوو)دا بەدی دەکرێ. دیارە ئەم هەموو ناوەڕۆکە کاری خۆی زۆر چاک لە شکڵیش دەکرد.

دوا بەرهەمی ئەم ریزە داستانە داستانەکەی بەدرەدینە. لەمانەدا لە رووی شکڵەوە، سروشتەکانی کێشی نێو خەڵک، سروشتەکانی ئەدەبیاتی دیوان، بەلای منەوە تا ئەوپەڕی لەکار هاتوون. لەلایەکی ترەوە، ئەم کتێبە، لە رووی شکڵەوە موحاسەبەیەکی سەرلەبەری ئیمکاناتەکانی شکڵ بوو کە تا ئەو سەردەمە وەدەستم هێنابوون. لەم کتێبەدا، کە پەلەی تێدا کرا و توانرا تەنیا نیوەی بنووسرێتەوە لەم کتێبەدا لە رووی شکڵەوە ویستم هەموو قۆناغەکانم، هەندێ جار لە پارچەیەکدا و هەندێ جار لە پارچەی جۆ جۆدا بەکار بێنم:

**گەرمە**

**گەرم**

**کێردێکی دەسک خوێناوی، ئاسنی کولە**

**گەرم...**

یا:

**«گوتمان،**

**گوتمان**

**ببینین**

**بنووسێین**

**بەدەستەدووەکەوە**

**با سەرێک ئێمەش زەویی ئەم برایە**

**لێ خورین، گوتمان.**

یا:

**ڕەخت کەسک و ئاڵ، تاڵ تاڵ**
**ئاوریشمی بورسە،**
**چینی کوتاهیای وەکو باخچەیەکی**
**شین بەدیوارەوە**
**مەسینەی زیوی پڕ لە شەراب**
**بەرخی سوورەوەکراو لەسەر**
**سینیی مس**
**براکەی خۆی مووسای بەتاری**
**کەوان خنکاند**
**لە لەگەنێکی زێڕی نوێدا بەخوێنی**
**برا دەستنوێژی هەڵگرت.**
**چەلەبی سوڵتان محەمەد لەسەر**
**تەخت بوو خوونکار بوو...**

لام وایە لە دوای ئەم کتێبە، مەسەلەکانی شکڵ، پاش چوونە زیندانم، لە مێشکمدا پتر بریقەی پەیدا کرد. لە پێشدا ئینکاری ئیمکانی هیچ شکڵێک ناکەم، هیچ تەرزێک لە حیسابان دەرناهاوێژم.

شیعر، قافیەدار، بێ قافیە، بە کێش، بێ کێش، پڕ وێنە، بێ وێنە، بە هەرا و گاڵە، کڕوکپ، هەمووی دەکرێ بنووسرێ، هەر هێندە بەسە ئەوەی کە دەنووسرێ گونجاوترین شکڵی خۆی، هەندێ جار بەپێی قۆناغێکی مێژوویی گونجاوترین شکڵی خۆی - زۆر بەوەستایانە لەبەر کرابێ.

من بەش بەحاڵی خۆم دەمەوێ شکڵ بەجۆرێ لەگەڵ ناوەڕۆک و خۆیەتیدا بگونجێنم و جۆشیان بدەم کە ناوەڕۆک و خۆیەتییەکە دوو هێندەی تر ڕوون بکاتەوە، بەڵام شکڵەکە خۆی ڕوون نەبێ، ئەمە وەکو ئەو گۆرەوییە وایە پووزی ئافرەتێکی جوان هێندەی تر جوانتر دەکا بەڵام گۆرەوییەکە لەبەر تەنکی

بەحاڵیش نابیندرێ. ئەمە ئەو شکڵەیە ئەمرۆ تەرجیحی دەکەم. بەڵام بێگومان، سبەینێ دەتوانم شکڵە ڕەنگاوڕەنگەکانیش تەرجیح بکەم. لە پاشان، بەپێی ئەو قەناعەتەی ئەمڕۆ گەیشتوومێ، شیعر هەرچەند کورت بێ و تەنانەت لە کورتترین شیعردا، پێویستە شکڵیش بەپێی مەوجدانەوە و کشانی ناوەڕۆک و خۆیەتی بکشێ و مەوج بداتەوە. مەسەلا شیعرێک کە بێ قافیە دەست پێ دەکا پاش ئەوەی لە قافیە مقەیەدەکان دەترازێ، دوایی دیسان دەکرێ بەبێ قافیە کۆتاییی پێ بهێنرێ، یا بەپێچەوانە، یا دەکرێ ڕیزکارییەکی شکڵیی تری بۆ بسازێندرێ. ئەمە لە ڕووی زمان و ئاواز و ئاهەنگیشەوە هەر وایە.

لە پاشان مرۆ تا بۆی بکرێ قسەکانی کورت و قەدبڕ بن چاکە، پیاو تا پتر بۆی بلوێ خۆی لە ڕووکەشکاری بدزێتەوە پەسندە. تەواوی ئەم قسانەی کردم لە شیعری (دیمەنەکانی مرۆڤ) و شیعرەکان سەردەمی دواییدا تاقی کردووەتەوە و بەنموونەش دەلوێ ڕوونی بکەمەوە:

**سەرلەبەری دەرگەکان داخراون**

**هەموو پەردەکان دادراونەوە**

**لە کوێن، لە کوێن، لە کوێن**

**لە شوێنێکن نەکەسی بۆ دەچێ و**

**نەکەسی لێوە دێ**

**لاڵەکان لە دوورەوە زۆر لە**

**دوورەوە لەگەڵ کەرەکان فسکە**

**فسکیانە.**

**نیگا چاوی نییە لەشکر بێ پێیە**

**هێندەم گرتن ڕاونا ماندوو بووم**

**با جگەرەیەک بکێشم.**

دەمەوێ تا بۆم بلوێ، خۆم لەو شتانەی کە شیعر دادەپۆشن: وەکو مانگەشەو، دووکەڵ، تووڵ، هێمابازی، یا قسەی باڵدار و حەماسەتی ئەسپێ

کە دەکەوێتە شاخ و باڵ و ئیتر چیی تر؟ دەمەوێ خۆم لە هەموویان لادەم. نەک دێڕێکی زیاد بگرە نامەوێ وشەیەکی زیادیش بنووسم، دەمەوێ ئەوانەی هەستیان پێ دەکەم، ئەو شتانەی بیریان لێ دەکەمەوە، بەڕووت و قووتی زیندوووەوە ڕاستەوخۆ و یەکسەر و لە قەدبڕترین ڕێگەوە بیاننووسم. دەمەوێ بۆ هەر ناوەڕۆک و خۆیەتییەک گونجاوترین شکڵ پەسند بکەم نەک هەر لە ئەدەبیاتی خۆم، بگرە لە نەریت و عەنعەناتی سەرلەبەری ئەو ئەدەبیاتانەش سوود وەرگرم کە دەیانناسم. تەنانەت ئەگەر پێویست بێ هەندێ جار نەریت و عەنعەناتی ئەدەبیاتەکەی خۆشمیش دەخەمە لاوە. قەناعەتیشم بەوە نییە کە لە ئەسەرێکدا دەبێ نەریت و عەنعەنەیەک گەشە پێ بدرێ و هەر ئەوە بەماکی ئەدەبەکە بزانرێ. هەموو هونەرمەندێک تا دوا هەناسەی دەبێ لە گەڕان و لێکۆڵینەوەدا بێ. جا لەم گەڕان و سووڕانەدا دەبێ بۆ هەر ناوەڕۆک و خۆیەتییەکی دیاریکراو گونجاوترین شکڵ بدۆزێتەوە، تا دەتوانێ خۆی لە خۆدووبارەکردنەوە بپارێزێ، کەسایەتیی خۆی نەدۆڕێنێ، لاسایی نەکاتەوە.

هەڵبەتە دەبێ سوود لە کۆمەڵێ بنکەی ئەزموونکراوی هونەر وەرگرێ، پێویستە سوود لە نەریت و عەنعەناتی هونەری خەڵکەکەی خۆی، هونەری خەڵکەکانی جیهان، هونەری کلاسیکی گەلەکەی خۆی و گەلەکانی جیهان وەرگرێ. بەڵام هەروا بەسادەییەوە دەبێ سوودیان لێ وەرگرێ، نابێ کۆت و زنجیریان لە پێ بکا.

لێرەدا سەرنجتان بۆ وشەی هەموو مرۆڤایەتی ڕادەکێشم، سەرپاکی مرۆڤایەتی تەنیا ئەوروپا. تەنیا یۆنانی کۆن، ڕۆمانیە. بەئاسیاوە، بەئەفریقاوە، بەئەمەریکای کۆن و نوێوە، مرۆڤایەتی برێتییە لە هەموو دنیا کلاسیکەکانی چین، ژاپۆن، کلاسیکەکانی هیند، ئێران، تورک و هونەرمەندانی نێو خەڵک، بەگشتی بەشی ئەم وڵاتانە لە خەزێنەی کولتووری مرۆڤایەتی لەم بەشی ئەوروپا و یۆنانی کۆن و ڕۆما و ڕۆینەسانس لە خوارتر نەبووە... ئەمە لە ڕەسمیشدا، لە شیعریشدا، لە پەیکەرتاشیشدا، لە ئەدەبیاتیشدا، لە سەما و ڕەقسیشدا هەر بەو جۆرەیە.

مادام لە کلاسیک دەدوێین، دەمەوێ هەندێکی تر لەسەر ئەم باسە بووەستین. هەندێ لە ڕەخنەگرەکان حەزیان لەوەیە کلاسیکخوازەکان و نوێخوازەکانی ئەمرۆمان بەگژ یەکدا بکەن و بیانکەن بەدوژمنی یەک. ئەم جۆرە حەز و مەیلەش وەنەبێ تایبەتی بێ بەڕەخنەگرانی ئەم سەردەمەی ئێستامان، ئەمە هەر لە کۆنەوە باو بووە... ڕاستە؟ بەلای منەوە ڕاست نییە، جارێ کە دەڵێین کلاسیک چی لێ تێ دەگەین؟ بەکام هونەرمەند دەڵێین کلاسیک. بەپێی کتێبەکانی ئەدەبیاتی فەرەنسی، بەپێی زۆربەی زۆری ڕەخنەگرەکانیان، ئەدیبەکانیان، کۆرنەی، ڕاسین، مۆلیێر، نووسەری کلاسیکن. هەرچی ڤیکتۆر هۆگۆیە، بۆ نموونە ڕۆمانتیکە. گۆتەش هەر ڕۆمانتیکە، پۆشکینیش ڕۆمانتیکە، بەڵام بەگوێرەی بەشێکی زۆری ئەدیبەکانی ئەڵمانیاوە، گۆتە، شیللەر کلاسیکی ئەدەبیاتی ئەڵمانن. هەروەکو بەگوێرەی ئەدیبە رووسەکان پۆشکین و لێرمۆنتۆف شاعیری کلاسیکن. کەواتە وشەی کلاسیک و ڕۆمانتیک بەگوێرەی هەموو وڵاتەکان دەگۆڕێ. بەڵام تۆ بڵێی ئەندازەیەک بەگوێرەی هەموو وڵاتەکان نەبێ؟ هەیە. وەنەبێ تەنیا یەکێکیش بێ. چەندین ئەندازە هەیە. من لە گرینگترینیان دەدوێم. هونەرمەندی کلاسیک نوێکاری سەردەمی خۆیەتی، ئەو کەسەیە کە شتی نوێی هێناوەتە بەرهەم. هەڵبەتە ئەم نوێکارییە ئەوەیە کە بەر زەبروزەنگی زەمانە بگرێ. واتە هونەرمەندی کلاسیک، ئەو باخەوانەیە یە نەمامێکی نوێی لە باخچەی هونەردا ڕواندووە. نەمامەکەش بەرگەی هەموو وەرز و با و زریان و شەختە و بەستەڵەک و زوقومێکی گرتبێ و هەڵی دابێ و فراژی بووبێ و تا ئێستاش سەوزایی و نشونمای خۆی پاراستبێ.

با لەم ڕووەوە پۆشکین بەنموونە بێنینەوە: بێگومان ئەم شاعیرە هەرە نوێخوازی سەردەمی خۆی بوو. جا چ لە ڕووی ناوەڕۆک و خۆیەتییەوە و چ لە ڕووی شکڵەوە نوێیایەتییەکی زۆری بەشیعری رووسی و شیعری دنیا بەخشیوە. ئەم نوێیاتییانەش کورسیی خۆیان بەستووە و چەسپیوون. هەر سەبارەت بەمەشە کە کلاسیکن. کەچی لە سەردەمی خۆیدا هیچ بەکلاسیک لە

قـەڵەم نەدەدران. با لـە مـایـاکۆفـسـکی بدوێین، ئەم شـاعـیـرە مـەزنـە تازەیەش ئەمڕۆ کلاسیکە.

کـەواتا کـلاسـیـکایـەتی دوژمنی نـوێیـایەتـی نیـیـە. بەپێـچـەوانەوە، هـیچ هونەرمەندێک لە سـەردەمی خۆیدا نوێکار نەبووبێ نەبووە بەکلاسیک.

لە باسـی هـونەردا گەورەترین دوژمنمـان (سـێکتـەر – تعـصب)یەتیـیە، کـە سێکتەرایەتیش جۆرێکە لە (نهلیست – عدمیه)ت.

سـێکتـەر جگە لە زەوق و چێـژی خـۆی بـەولاوە باوەڕی بەهیچ شـتـێکی تر نیـیـە، هـەرچی گـۆشـە و نیگایـەکی هونەریی تر هـەیە هیـچی بەهیـچ نازانێ و نایسـەلمێنێ. جارێ خـۆ ئەوە لەلایەن شکڵـەوە سـێکتـەرایەتی هێندەی خـراپە زۆرە هـەر وەختە بڵێم لە ژمارە نایەت ئەو کەسـانەی دەڵێن شیـعر بەبێ کێش و قـافیە نابێ مـێشکیـان هێندەی مـێشکی ئەو کەسـانە تەسکە کە دەڵێن شـیـعر نەکێشی دەوێ و نەقافیـە. شیـعر بەم جۆرەش دەنووسـرێ و بەو جۆرەش. ڕای ئەو کـەسـانەی کـە دەڵێن زمـانـی ئەدەبیات، بەتایبـەتی زمـانی شیـعر بەخـەیاڵ و تەشـبیـه و فـلان و فیـسـار دێتـە گۆڕێ تەنیـا زمـانێکی وا زمـانی شیـعرە چەند هـەڵەیە سـەلماندنی پێچەوانەی ئەم ڕایەش هێندە هـەڵەیە.

لە چاخی لاوێتیمدا منیش، قسـەی خـۆمـان بێ، کەم سێکتەر نەبووم، لە پاش ئەوەی کـە شـیـعـرم بەکێشی کلاسیـکەکـانی نێـو خـەڵک دەنووسـی، لە شکڵـدا دەسـتـم بەگـەڕان کـرد لە دووی نـوێیـایـەتی، بەگـوێرەی خـۆم، لەسـەر جـۆرە کێشێکی ڕەها و سـەربەست دەستم بەشیـعر نووسـین کرد. لە هیم و بنەڕەتدا دیسان ئەندازە و پێوانەی خەڵکی تێدا بوو.

لە باسـی قـافیـە و زمـانیـشـدا هـەر بـەو جـۆرە. بەڵام کـەوتمە لاف لێـدان و ئیـدیعای ئەوە کە شـیـعر تـەنیا هـەر بەم جـۆرە دەنووسـرێ و لەم شکڵـە بەولاوە بەهیچ شـکڵێکی تر نانووسـرێ. مـاوەیـەکی دوور و درێژ شـەمـەم لە شـیـعـری دڵداری نەکرد و نەمنووسـی.

تەنانەت وشـەی (دەروون)م لە شیعرەکانمدا بەکار نەهێنا، دەمگوت دەروون

پێوار و ڕەمزی شوعووور نییە، هی ئیحساساتە. سەردەمێک هەر خەریکی ئەوە بووم لە نوای ڕەنگاوڕەنگترین و بەئاواز و دەبدەبەترین شکڵەکانەوە غار بدەم، بیرم کردەوە ئەوانەی دەمویست بەخەڵکی ڕاگەیەنم ئەگەر بەم شکڵانە دەریان برم پتر بەدڵەوە دەنووسین و ساناتر گوێیان لێ دەگیرێ، زیاتر هەست دەبزێون. سەردەمانێکیش هات هەمووی پێچەوانە بووەوە، ویستم بەسادەترین شکڵ، بەو شکڵانەی کە بەرچاو ناکەون گۆرانییەکانم بۆ خەڵک بڵێم. کەی بەهەڵە چووم؟ بەلای منەوە ئەمەش پێویستە و ئەوەش، ئی تریش و ئی تریش. هونەرمەند بۆ ئەوەی خەڵک گوێ بۆ گۆرانییەکانی هەڵخەن بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەم شکڵ و ئەو شکڵ ناچارە تا دوا هەناسەی هەر لە گەڕان و سووڕاندا بێ. هەندێ جار ئەم گەڕان و سووڕانەی چەندین مانگ دەخایەنێ، جگە لە سەرێشە و دەمارکرژی هیچ ئەنجامێکی تر بەدەستەوە نادا. جا با وابێ. هەندێ جار بەهەڵە دەچێ. با بەهەڵە بچێ هونەرمەندێک سەری چەندین مانگ نەیەشێت، دەمارکرژی تووشی نەبێ، بەهەڵە نەچێ ئەوە هەر لە جێگەی خۆی دەمێنێتەوە.

من ئێستا لە هەموو شکڵ و شێوەکان سوود وەردەگرم. بەکێشی فۆلکلۆرییانەی خەڵکیش دەنووسم، شیعری قافیەداریش دەنووسم، بەپێچەوانەشەوە دەنووسم. لە دڵداری و سەودا، لە ئاشتیش، لە شۆڕشیش، لە ژیانیش، لە مەرگیش، لە پەژارە و خەمیش، لە ئومێد و نائومێدیش لە هەمووان دەدوێم. دەمەوێ هەرچی سەر بەمرۆڤایەتییە و تایبەتی ناوەڕۆک و خۆیەتییە سەر بەشیعرەکانم بێ و تایبەتی هەڵبەستەکانم بێ. دەمەوێ خوێنەرەکانم بتوانن هەموو هەست و نەست دەربڕینەکانیان لە مندا، یا لە ئێمەدا بدۆزنەوە، کاتێ دەیانەوێ لەبارەی یەکی مایسەوە شیعر بخوێندرێتەوە ئێمە بخوێننەوە. کاتێ دەیانەوێ لەبارەی دڵداری بێ پاداشت شیعر بخوێننەوە لە دوای کتێبەکانی ئێمە بگەڕێن. شاعیر لەبارەی خۆیەوە بدوێ یا نەدوێ دەنگی بەتاکە کەسێک یا ملیۆنان کەس ڕابگەیەنێ، نیگای فەلسەفی و سیاسیی ئەو شاعیرە ڕوون ناکاتەوە. چەندین شاعیر هەن لەگەڵ ملیۆنان مرۆڤدا دەدوێن و

هیچ باسی خۆیان ناکەن، لە نوێنەرانی فەلسەفەی سۆفییەت و سەبجەکتیف و ئایدیالیستن. بەپێچەوانەوە چەندین شاعیری وا هەن کە تەنیا باسی خۆیان دەکەن، یا زۆر جار باسی خۆیان دەکەن ماتریالیستن، جا شیعری ئەم شاعیرانە بووە بەماڵی کۆمەڵەکان.

هەرچی خۆمم حەز دەکەم لە شیعرەکانمدا تەنیا لە خۆشم بدوێم و دەمەوێ لە سێویێکیش بدوێم، هەروەها دەمەوێ لەبارەی خاکێکی کێڵدراو و لەبارەی ڕۆحی کەسێک کە لە زیندان دەگەڕێتەوە بدوێم، دەمەوێ لەبارەی شۆڕشی ئەو کۆمەڵانەی کە بۆ ڕۆژێکی خۆشتر تێ دەکۆشن، لەبارەی خەم و پەژارەی تاکە کەسێک کە باسی دەردی دڵداریی خۆی دەکا شیعر بڵێم.

دەمەوێ هەم لەبارەی لە مردن ترسانەوە و هەم لەبارەی لە مردن نەترسانەوەش شیعر بنووسم.

دەبێ هونەر تەرجومانی ئێش و ئازاری خەڵک، دەرد و مەینەتیی خەڵک، هیوا و ئاواتی خەڵک، خۆشیی خەڵک، خەم و حەسرەت و پەژارەی خەڵک بێ. ئەوەی لە بیروباوەڕی هونەرمدا نەگۆڕاوە ئەمەیە. لایەنەکانی تر هەمیشە لە گۆڕاندایە و دەگۆڕێ. ئەوەی ناشگۆڕێ، بۆ ئەوەی بتوانم بە هەرە هەست بزوێن، بەوەستایانەتر، بەسوودتر، جوانتر و پێکەڵتر رای بگەیەنم، بەبێ ماندووبوون دەگۆڕێم و دەگۆڕێم.

**ئەو بیروباوەڕانەی کە نازم حیکمەت لەبارەی هونەرەکەی دەری بڕیوە هەندێکی بەدەستی خۆی و هەندێکی بەمن نووسیوەتەوە.**

پاشکۆی عێراق، ژمارە ١٢ – ١٣، شوبات و ئاداری ١٩٧٨

# ڕیپۆرتاجی تانگانیکا له ١٠ نامەدا

نازم حیکمەت

**نامەی یەکەم**

بەدەشتە بەفرگرتووەکانی ئۆکرانیادا دەفڕم.
چەندین ساڵە، ئەمە یەکەم گەشتی ئاسمانیمە بێ تۆ.
لە دەستت گەڕام کە لە زەوی دابڕام،
ڕاهاتنە،
کە دەشنیشمەوە هەر دەگەڕێم.
دوێ شەو باوڵەکەم دەپێچایەوە،
سەرشانەکانت خەمبار بوون،
بەڵکو واش نەبێ، من پێم وابوو، چونکە حەز لە خەمباربوونیان دەکەم.
ئەم بەیانییە لەگەڵ ڕووناکیی بەفردا بەخەبەر هاتم.
مۆسکۆ لە خرپەی خەودا بوو، تۆیش لە خرپەی خەودا بووی.
قژت لە ڕەنگی کا، بژانگت شین.
گەردنە سپییەکەت درێژ بوو، خڕ بوو،
لێوە سوورە گۆشتنەکەت بەباریێ خەمەوە.
ڕەنگە واش نەبێ، من پێم وابوو، چونکە حەز لە خەمباربوونی دەکەم.
بەسەر نووکی پەنجەوە دام کێشایە نێو ژوورەکەی لاتەنیشتەوە.
وێنەکەت لەسەر مێزەکەم بوو، سەیری خۆرەتاوێکی هاوینانت دەکرد،

لە لارِا وێنەکەت گیرابوو.
بەتەنگ ڕۆیشتنمەوە نیت.
ئاخنیمە گیرفانمەوە.
دنیا تەواو ڕوون بووەوە.
تابلۆیەکی بۆیەی چەوری دینۆ بەدیوارەوە:
گەواڵۆکەیێ هەور بە ڕووی ئاسمانێکی بێ سنوورەوە،
ڕەنگە نەڕووی ئاسمان، نەهەور،
بزاوتۆکەیەکی سپی لە شیناییەکی بێ سنوورەوە،
نیگاری گەشبینی، بەختەوەری.
ژنە دەرکەوانەکان لە حەوشە کرەکرِ دەستیان بە بەفرماڵین کرد.
چوومە ژوورەوە.
لە سەر و سوورەتم ڕاماوی، پەشێو، خەمناک،
ڕەنگە خەم نەبێ، چاو خەواڵوویی بێ،
گوتم: «بۆ بەرێکردنم مەیێ»،
کەچی هەر وەخت بوو بۆ بەرێکردنم سوێم بێتەوە، تۆ نازانی.
باوڵەکەمت بەدەستی خۆت کلیل دا.
دەرکەم کردەوە چوومە نێو دالانەکە.
تۆ لە ژووریێ لەگەڵ دەرکەدا دیمەنی بەهاریێ بووی، دیمەنی بەهاریێ
لە گەرمەی چێشتاندا، گەڵا و ئاونگ یەکپارچە بریق و باق.
بێ سێبەر.
دەرکەم لەسەر پێوە دای.
تا گەیشتینە ڤۆنۆکۆڤا، دوو بەدوو لەگەڵ (ئەکبەر) هەر لەبار تۆوە
دواین،

ڕاستت دەوێ هەر من قسەم دەکرد، ئەو گوێگر بوو.
وا بەسەر دەریای ڕەشدا دەفڕم، لە بڵیندیی هەشت هەزار مەترەوە.
نازانم لە بیرت دێ،
ئەوە بوو بەساڵێ،
پێکەوە بەسەر وارشۆ - ڕۆما - پاریسدا بۆ قاهیرە فڕین.
تۆ بڵێی قاهیرە هەر ئەو قاهیرەکەی جاران بێ بێ تۆ؟
لە بڵیندایی هەشت هەزار مەترەوە، وام بەسەر ئەنەدۆڵەکەمەوە.
لە قووڵاییی هەشت هەزار مەتردا، لە ژێر هەورەوە، وڵاتەکەم
زستانی ڕەش.
گوندەکان لەمێژە ڕێیان بڕاوە، ڕێبەندانە.
هەریەکە بەتاقی تەنیا لە چۆڵێکی بەفرگرتوودا.
شۆربای ساوار بەبێ چەوری.
لەبەر چەق و دووکەڵی تەپاڵە چاو چاو نابینێ.
ساوا هێند زوو دەمرن، وەختی ئەسپێ و ڕشک تێدانیان وەچەنگ ناکەوێ.
کەچی منیش لە بەرزاییی هەشت هەزار مەترەوە، لە سەرووی هەورەوە
دەفڕم.
بەڵێ ئاوها تولیاکۆڤا...

**نامەی دووەم**

لە قاهیرە باخچەی ئوزبەگییەت لەبیرە؟
چووم ئەو ڕیزەی لێی دانیشتین دیتمەوە.
لاقی شەلەیان هێشتا نەگرتووەتەوە.
شەو بوو، بەبیرت دێ؟
دنیا تێکەڵ و پێکەڵ،

ئەستێرە، چرا و چراخانی ئۆتۆمۆبێل، جامخانەی موغازەکان.
دەرۆزەکەرە دیزداشە درێژ لەبەرەکە.
لە ژنە خەمبارەکە دواین لەبیرتە؟
دەموچاوی لە نیڤەرتیتیی قرالیچە دەچوو.
مێردە کۆمۆنیستەکەی پێنج ساڵە لە گیانەلادایە،
لە ناوەندی چۆڵێ، لە وارگەیەکی بەند داکردن.
لە قاهیرە باخچەی ئۆزبەکییەت لەبیرە؟
چووم ئەو ریزەی لێی دانیشتین دیتمەوە.
لاقی شەلەیان هێشتا نەگرتووەتەوە.
دار و درەخت بەم رۆژگارە هەر وا تۆزاوین.
دەرۆزەکەرە دیزداشە درێژ لەبەرەکە بەجارێ وشک و رەق هەلاتووە.
مێردی ژنە خەمبارەکەیش بۆ خۆی مردووە.
لە قاهیرە باخچەی ئۆزبەکییەت لەبیرە؟

**نامەی سێیەم**

شەوێ، درەنگێ، لە قاهیرەوە فڕین
لە دوور چرای سووری لێک دابڕان بەسەر نووکی باڵەکەوە دەسووتا.
توند توند دەستم بەئەستێرەکانەوە گرت، لێی نووستم.
لەگەڵ چاورۆشنانی بەیاندا لە فرۆکەخانەی خورتووم نیشتینەوە،
چاورۆشنانێکی سپی، بێ هەور و هەلا،
چاورۆشنانێکی وەک چوری شیر،
وەک کاژە فنجانی تەنک.
– فرۆکەخانەی سوودان (کۆمێت)ێکی لێ بوو هێندەی دێوێ.
فرۆکەیەکی وەرزشوانیی لێ بوو زەرد، سوور، چکۆلە و خنجیلانە.

– ئەوە چی بوو هیچی لێ حاڵی نەبووم.
فرۆکەخانەی خورتووم پاک و خاوێن.
ڕۆژ فێنک فێنک بەرز دەبووەوە.
بەرانبەری لێی دانیشتم، پاڵتۆیەکەم لە شان کرد.
لە هەر کوێ بم،
تەنانەت لە زیندانیشدا
ڕۆژگارم بە موژدە بەگوێ چرپاندنەوە دەست پێ دەکا.
سوودانییەکان جوانن.
– ژنە سوودانییەکی شاعیر دەناسم، شای جوانانە –،
لەسەر داری هەرە ڕەسەنی ئەبەنۆس هەڵکەندراون.
بەکراسی سپییەوە، بەسەرپۆشی سپییەوە، بەمێزەری سپییەوە.
ئەفسەری سوودانی دێن و دەچن، بە ئینگلیزی قسە دەکەن،
نێچیروانە سوورە چاوکاڵەکان وێسکییان دەخواردەوە.
نێچیروانەکان بۆ ڕاوە شێر هاتوون.
وە بۆ ڕاوە لۆکەیش.
تفەنگەکانیان کیفیان نایلۆنە.
ڕۆژ ڕمبێ بەرز بووەوە.
پاڵتۆیەکەم فڕێ دا، چاکەتەکەم دەرێنا.
(کۆمێت)ی تاین وەک ئاورپژێن گرماندی،
فڕی بەرەو لۆندەرە.
تۆ لە کوێ بزانی کچم،
عوسمانییەکانی منیش لەم خاکە سوورە کۆیلەفرۆشییان دەکرد.
کۆیلەکان بەژنیان دوو مەتر،

دانی فیل، زێڕ،
باج و سەرانەیان خڕ دەکردەوە، ژنان، لە دەرلنگی دەرپێوە پشیلەیان
تێ بەردەدان.
ئەم دەستووورە ڕەنگە ئێستاکەیش هەر باو بێ لە ئەنەدۆڵ.
بەڵام کۆیلەکانی ئەنەدۆڵ کورتەبنە و ڕەقەڵەن.

### نامەی چوارەم

ڕەنگە باڵدار لە ئەستەمووڵەوە، لە مۆسکۆوە بێن بۆ داروسەلام.
باڵدار لە کوێوە بۆ کوێ ناچن.
بەڵام یەکەم فرۆکەی مۆسکۆیی تا ئێستا بەچڵی ئەم خاکەوە نیشتبێتەوە
هینەکەی ئێمەیە
یەکەم ئەستەمووڵیش منم.
بۆنی ئافریقام بەر لووت کەوت،
بۆنی ئافریقای گەورە، ئافریقای ڕەش:
بۆنی دار و درەختی زل، زیندەوەری زل، خۆری زل، بارانی زل،
ئەستێرەی زلی لێ دێ.
بەناو دارخورما و دارمۆزدا چووینە ناو شارەوە.
ئینجا چووینە ناو ماڵە شووشەیەکەوە[1]، ئەوەندی چاو بگرێ سەوز،
ئەوەندی چاو بگرێ گەرم.
لە ڕۆژاوای داروسەلام، لە ئۆقیانووسی هیند،
بەر لە محەمەد عەرەبە بازرگانەکان لەگەڵ قورسانە عەرەبە
برۆ ڕەشەکاندا گەیشتنە ئەم کەناراوانە.

(١) مەبەست لە ماڵە شووشە: ئەو شوێنانەیە کە بۆ ماسی بەخێوکردن و نموونە شەتڵە درەخت دروست دەکرێن.

لە پاشان قورسانی تر لەگەڵ قورسانی تردا.
ئەمانە برۆیان خورمایی بوو.
بەڵام مەسەلەکە کاری بەبرۆوە نییە.
پێتەختی تانگانیکا داروسەلام.
تانگانیکا.
تانگانیکا، تانگانیکا.
هۆرەیەک بەم ڕەنگە دەتوانێ دەست پێ بکا
لەسەر هەوای تەم تەم:
تانگانیکا، تانگانیکا...
لە خەمباری، لە دڵشادی، لە ژیری، لە شێتی، لە سەوزی،
لە سووری، لە زەردی، لە ڕەشبۆری، لە ڕەشی.
تانگانیکا، تانگانیکا...
دەزانی،
تانگانیکای باشووری ڕۆژهەڵاتی ئافریقا،
١٠ ملیۆن ئینسانی تێدا دەژی لە ١٢٠ هۆز.
لە موسڵمان، لە عیسایی، لە بتپەرست.
دەزانی،
ئیرووی سەرەکی: قاوە، پەز، گوشە.
گەڵاگوش شمشێرێکی ڕووتی سەوزە.
شریت و گوریس و جروجەواڵی لێ ساز دەکرێ.
دەزانی،
ئەمانەم هیچیان بەر لەم گەشتەم نەدەزانی.
گەشتەکەت بەبیر دێ پێکەوە لە هارتا کردمان.

کەشتییەکەمان سێ ستوونی بوو، سەری کەوانی.
وێنەی کچە زێڕەکەی بەپێشەوەی کەشتییەکەوەیە لە خۆت دەچێ.
لەبیرتە شیعرەکانم لەسەر ئاڵاکەی بوو نووسیت؟
وە ڕاوە ماسیمان کرد، هەموو چاو زومڕووت چاو زومڕووت.
باڵدار بەستوونەکانەوە نیشتبوونەوە، شاپەڕ سوورمەیی، شاپەڕ سوورمەیی.
لە گوێ دەریاکانەوە مەیموون مۆزبارانیان کردین.
بە پشتەبا لە دەریا گەرمەسێرەکانەوە تێ پەڕین.
هەروەها وەرسووڕاینەوە بەهەزار حاڵ لە تۆڕی دایەرە قوتبییەکان
ڕزگار بووین.
تا داروسەلاممان
دۆزییەوە.
گەشتەکەت بەبیر دێ لە هارتا پێکەوە کردمان؟
لە داروسەلام لەگەڵ سەربازە کەسنەناسە تانگانیکاییەکەدا قسەم کرد.
لە برنجە داڕێژرا بوو، لە هێرشبردندا،
بەسەر لاقە باریک و ڕووتەکانیەوە ڕاوەستابوو چەک بەدەست.
بولوارێکی لە پشتەوە، بەرانبەر بە شۆسەکە، جامخانەی موغازەکان.
لای ڕاستی بینای بانقێ، لای چەپی کڵێسەیەک.
– گوتم هێرش بۆ سەر کێ دەبەی؟
– گوتی بۆ ئەڵەمان.
گوتی هی ئەڵەمان بووین، تا شەڕی یەکەمی جیهان.
ئینگلیز هاتن، کۆمیتەیان گرت، لە ئەڵەمان ڕۆهاتین.
ئەڵەمان ڕۆیشت، ئینگلیز مایەوە.

ئینگلیز لە ١٨وە تا ٦٢ مایەوە.
لە ٦٢دا پاڵمان بە ئینگلیزەوە نا،
گوتی، کۆماری سەربەخۆین
هەر هێندەی گوت و بڕییەوە.
داروسەلام شارۆکەیەکی دڵگیرە
شارێ و شەقامەکانی پاک و خاوێن، بەتەعمیرات و ئاوەدان و خۆشن.
گەڕەکێکی گەورەی خۆشی هیندییەکانی لێیە.
هیندییەکان بێ بەزە سەرگەرمی بازرگانین.
بۆیان بکرێ ئاوی ئۆقیانووسەکانیش بە شووشە دەفرۆشن.
تانگانیکایی دژمنی سەری هیندییە بازرگانەکانن.
یانەیەکی ئینگلیزەکان لە نێو شاردایە.
وەختی خۆی هەر بۆ سپییەکان بوو.
ئێستا ناوەکەی گۆڕاوە، هاتوچۆکەرانیشی.
کۆشک و سەرای سەرکۆمار.
وەختی خۆی والیی ئینگلیزی تێدا بوو.
کۆلێجێکیش، ٤٨ قوتابیی هەیە، هەموو تانگانیکایی.
پرۆفیسۆرەکان ئینگلیزن.
کڵێسە، مزگەوت، ڤێللا، ئوتێل، باڵیۆزخانە،
باڵیۆزخانەی سۆڤێت لە خانووی موسڵمانێکدایە.
دەرگاکەی بیسمللایەکی بەئەلفبێکەی عەرەبیی لێ نووسراوە.
تراموای و پاس و فڵانی نییە،
بەڵام لە هەر مارکەیەکت ئۆتۆمۆبێل دەوێ هەیە.
هەمووشیان سوکانەکانیان لای دەستە ڕاستەوەن.

سیستێمی ئینگلیزە.
شوفێری تانگانیکایی فرە وەستان.
کابارێتشی لێیە تا بەیانی دەر وەتاک.
تانگانیکاییەکان، خەڵکی ولاتەکە
لە زنج و کولبەی قەمیش و ژاژدا لەسەر زەوی دەژین.
زمانی دەوڵەت بەسەواحیلی و ئینگلیزییە.
ئەندازیاری تانگانیکایی لە سەرانسەری تانگانیکادا
١ دانەیە.
٣ پزیشک
سەرخۆشی تانگانیکاییم نەدیت.
سەرخۆشەکان لە سپییەکانن.
سپیی بێ کارم نەدیت.
بێ کار هەموو تانگانیکایین.
ئەوانەی لەسەر شۆسەکان شێرەدارینە بەتووریستان دەفرۆشن
تانگانیکایین.
ئەفسەری تانگانیکاییم دیت، سەرکۆمارم دیت، مامۆستام دیت.
سەرکۆمار نایرێری بێ وچان بەچاوی مامۆستایەکی خەیاڵ بردووەوە لە
دیوارەکانەوە سەیر دەکا.
لە نێو چوارچێوەکەیدا، لە ژێر جامێکەوە دانیشتووە، خۆی بەسەر
باستۆنە سپییەکەیدا داوە.
پۆلیسەکان، ئەوانە من دیتمن تانگانیکایی بوون.
لە بانقەکاندا کارمەندی تانگانیکاییم نەدیت.
یا سپی یا هیندین.

گارسۆن و حەماڵ تانگانیکایین.
گوندییەکانیش، شوانیش، کرێکاریش، سەرەک خێڵ و هۆزانیش.
لێروکانەیش فێست لەسەر زۆرن، ڕەنگاوڕەنگ، بابەت بابەت،
بەگێز و گوڵینگ، بێ گێز و گوڵینگ.
ئێمە، تورک، فێستمان لە یۆنانییەوە وەرگرتووە،
لەسەر عەرەبانمان داوە،
ڕەنگە لەسەر سوودانییانیش،
ئەوانیش لەسەر ئافریقاییی ڕەش،
یا ئەوان، یا ئینگلیز،
ئینگلیز لەسەری نابن،
کەرکەدەنێکی فێس لەسەر ببینم سەرسام نابم.

**نامەی پێنجەم**

لە یانەی (سپای ڕزگاری) لە داروسەلام، لە گەرمان خەو لە چاوان ناکەوێ.
گەرما فیچق فیچق بەپێستمەوە دەنووسێ.
ژن و مێردە کەنەداییەکان دوعای شێوانیان بەماگنیتۆفۆن[٢] لەمێژە لێ دا.
شێر نەڕەیان نایێ.
شێر لە ژوورێن.
شێر، فیل، کەرکەدەن،
زێبرا، زورافە، مامز.
لە مۆسکۆ، لە پارکی زۆلۆجی پڵینگیش هەیە، ورچی سپیش،

---

(٢) ریکۆردەر، موسەجیلە.

پێنگوینیش.
دۆندرمەی سەرتوێژداریش هەیە.
لە مۆسکۆ کولوو کولوو بەفر دەبارێ.
گەرما بەپێستمەوە دەنووسێ
لە ژێر پەردە و کولەکەمدا ڕووت و قووتم.
سەر پەردە و کولەکەم قومقومۆک تەنیویە.
قومقومۆک لە چەشنی بێچووە تیمساح، زمانیان دەردێنن،
ڕەنگە قومقومۆکیش نەبن.
لە بەندیخانەکەی بورسە پەردە و کولەمان لە چەرشەفی نوێنەکان
دروست کرد،
سبەینان تەختە کالۆسمان بە مەشکە فڕێ دەدا.
گەرما بە پێستمەوە دەنووسێ.
گەرما لە نەبزمدا پل دەدا.
بەخوێنی شادەمارەکانمدا دەگەڕێ.
لە مۆسکۆ بەفر دەبارێ،
یانەکو نابارێ؟
پێش نووستن سەیرێکی تەرمۆمەترەکەت کرد بەتەنیشت پەنجەرەکەوە؟
١٥ لە ژێر سفرەوەیە، ١٧ لە ژێر سفرەوەیە؟
چرایەکی شین بەسەر سیسەمەکەتەوە.
بیر لە چی دەکەیەوە؟
یاخۆ هەرکە سەرت خستە سەر سەرین و نەخست، خەو خەوت لێ
کەوت؟
لە یانەی (سپای ڕزگاری) لە داروسەلام، خەو لە چاوان ناکەوێ.

**نامەی شەشەم**

ئەم بەیانییە سەیری ئۆقیانووسی هیندم کرد.
جووتێ قسەم لەگەڵت هەیە لەبارەی ئۆقیانووسەکان.
لە کەناری هەر ئۆقیانووسێکەوە بڕوانی
لەگەڵ مەرمەڕەدا جیا ناکرێتەوە.
ئۆقیانووسەکان لە خۆشەویستییەکی گەورە دەچن تولیاکۆڤا
لە سەیرکردن
ئۆقیانووس قنیاتی پێ دەکرێ.

**نامەی حەوتەم**

کووچە و بازاڕ گەڕام، ئافرەت!
نرخی شمەکانم یاداشت کرد.
تانگانیکا هەرزانییەکی سەیرە.
مەسەلا، هەتاو،
هەرە گەییوەکەی، هەرە سوورەکەی،
مەسەلا، باران،
لەوانی بەمانگان لێ ناکاتەوە، جۆری شەست و ڕەهێڵە.
یا لەرزوتێ، بابەت بابەت، هەمەچەشنە.
یا دەست و مەچەکی ئەسمەری تێر،
لە کاڵ، لە گەییو.
هەروەها لەوانی کە ناولەپ و نینۆکی هەموویان پەمەیی.
تەنانەت مۆز،
هەر هێشوویێکی پێنج کیلۆیی،

لە بوتڵێ پیپسی کۆلا هەرزانتر.
ئەمانەم بۆ نووسیت، هەردوو دییەکەم، بیر دەکەمەوە،
ئەی ئەنەدۆڵەکەی من، لە تانگانیکا گرانیترە؟
لە هێندێ جێی، باران زۆر گرانترە،
لە هێندێ وەرزدا هەتاو،
بەڵام نرخی لەرزوتا،
یاخۆ دەست و مەچەک،
خۆ یەکجار، ئەوانی پەنجە بەخەنەکانیان
هیچ لێرە هەرزانتر نین.
ئەگەر مۆز دەڵێی،
لای ئێمە پێ ناگا،
بەڵام پیواز و خوێ،
نەک پێنج کیلۆی، بگرە کیلۆیەکی
بەنرخی مۆزی ئێرەیە.

## نامەی هەشتەم

چۆنی تولیاکۆڤا، لە چ عالەمێکدای؟
قژە رەنگ کاینەکان چۆنن؟
لە چ عالەمێکدان مژۆڵە شینەکان؟
مژۆڵە شینەکان رێم بدەن،
دەمەوێ سەیری ناو چاوەکانتان بکەم،
بەشکو لە گەڕاندا لە نێو چاوەکانتاندا تووشم بێن،
بەشکو لە توێی دێری کتێبێکەوە،
لە (پێسچاننایا)ی دووەم، لە جێ سواربوونی پاسدا.

لە نێو چاوەکانتدا تووشم بێن و
بڵێن: (مەرحەبا نازم!) چۆنی، کەیفت سازە؟،
سڵاو لە ڕۆخانەکەی مۆسکۆ دەکەم،
سڵاو لە مەیدانی سوور، لە دووکێشی کارگاکان، سڵاو لە سەربەلەری شانۆخانەکان دەکەم،
سڵاو لە وێنەکەی ئەستەمووڵ دەکەم کە بەدیوارەوە هەڵواسراوە!
ئەگەر لە من دەپرسن، من ئەمە دوو ڕۆژە لە باکورم.
لە ئارووش، لە مۆشی،
لە دەوروبەری کوێستانە بەبەفرەکانی کلیمانجارۆم.
کوێستانێکی گەشت و سیاحەتە.
خۆشگوزەرانیی ئوتێلەکان بۆ ئیسویچرایییەکانە.
مۆشی، هۆزی جاگگای لێ دەژی.
لە ئوتێلان، لە مەزرا قاوەکان،
لە مەزرا گوشەکان کار دەکەن.
مەزرا گوشەکان هی ئینگلیزن، هی هیندین،
هی ڕۆمەکانن.
تیرەی جاگگا ڕووخۆش و ژیر و نەرم ڕەفتارن.
پیاویان بەکراسەوە، بەشۆرتەوە دەگەڕێن.
بەڵام زۆربەیان حەز لە سواریی پایسکل دەکەن.
ژنانیان بەکراسی ڕەنگاوڕەنگەوە بەلەنجەولار دەڕۆن.
وەک سەرلەبەری ژنانی ئافریقا، ئەوانیش باری لەخۆ زلتر بەسەر سەریانەوە هەڵدەگرن.
کیژی گەنج و جحێڵم دیت.

ڕەش ڕەش وەک بیبەری ڕەش، شیرین وەک شەکر و
بادام،
بەتەنوورەی فش و فۆڵەوە،
خوێندەواری لە ئەنەدۆڵ بەرزتر.
چووم بۆ نگۆرۆنگۆرۆ کراتێر.
زارکی ئاورپژێنەکە بەچیمەن و دار و درەخت تەنراوە.
گوتیان دوو سەد کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
کەرکەدەنی سیاحییانەم دیت
زورافەی سیاحییانە، فیلی سیاحییانە،
گەلە گەلە دەگەڕێن، تۆز دەکەن.
جێبەکەمان بەناویاندا دەڕوا، نزیک، هەر لە بن لووتیانەوە،
جار ناجارێ سەریان هەڵدەبڕن سەیر دەکەن،
مارکەی ئۆتۆمۆبێلەکە دەناسنەوە:
لاندرۆڤەر.
بەخەم و نیگەرانییەوە بەڕاست و چەپدا ئاوڕ دەدەنەوە،
وەڕەزییە.
برێ مامز نامۆییان لە لاندرۆڤەرەکە دەکرد،
بەگومەتە دایان کێشا.
ئێوارەیەکیان ئەمریکاییەک لەو سەر هەرێزە دەبوورێتەوە.
تا سبەینێ شێر لەسەری ئێشک دەگرن،
سەیر دەکەن بەهۆش نایەتەوە،
دەیخۆن.
گۆڕەکەیم دیت.

بەسەرهاتەکەی لە کێلی گۆڕەکەی نووسراوە.
دەوروبەر (ماسایی)یەکانی[٣] لێ دەژین، ڕووت و قووت،
تەنیا هەر عەیبی ژنان بەدەرەوە نییە.
ئینسانەکان درشت و زەبەلاح.
ئاشقە ڕەنگی قاوەیین.
خۆیان لە ڕەنگی قاوە وەردەدەن.
نەرمەی گوێیان لەسەر شانیان دەخشێ،
بەشتی قورس شۆڕی دەکەنەوە،
ماساییەکان ڕەوەندن.
پەز و ڕەشەوڵاخەوانن.
گۆشتی گایەکانیان دەخۆن و شیرەکەی بەگەرمی دەخۆنەوە.
هەر شێرێ هەڵکاتە گاڕانیان، لە گوێی دەگرن، بەڕمبان وەگی دەدڕن.
لە کراتێر چیتان لە هەموو پێ پەسندتر بوو؟
فیل؟
کەرکەدەن؟
ماساییەکان؟
مامز؟

**نامەی نۆیەم**

ڕۆژانی پاش لە زیندان دەرچوونم بەبیر دێتەوە،
نەک لە زیندان دەرکرانم، لە زیندان دەرچوونم،
ڕۆژانی لە ژوورەوەبوونی خۆم، لە دەرەوەبوونی دۆستان و بەزۆری[٤]

(٣) ناوی هۆزێکە.
(٤) زەغت، تەوژم. مەبەستی لە زیندان دەرکرانیەتی بەزۆری ڕای گشتیی جیهان.

ڕۆژگار لە زیندان دەرچوونم.
شادی،
شایی، جێژن
کەمێ سەرسام.
شادی،
چریسکەی خەون و خەیاڵ، ئاوات و هەویا بەلقەوە، نەک بەروبوویان،
چریسکەیان.
بەدەنگی بەرز مانای زیندان لە هەموو کەس و خۆت گەیاندن تا ئێستایش
بەدەم زیندان
چوونە خەونەوە ڕادەچێن.
بەیاسا و دۆزی سالآنی ساڵی زیندانەوە ڕاهاتن بەرۆکت بەرنادا.
زەرفی نامەکانت داناخەی،
قەرەوانە چاوەڕێکردن.
لەگەڵ ئێوارە داهات، دەرکە لە دەرێڕا کڵۆم دران،
چرا لەخۆڕا هەڵایسان.
شادی،
شایی، جێژن.
بەڵام ڕۆژانی جێژنیش هەروەک هەموو ڕۆژانی تر دواییان دێ.
سەیرەکەی ماڵەکەت دڵۆپە دەکا،
پەنجەرەکان، دەرکەکان چاکردنەوەیان دەوێ،
ئاوهێنان، گازکردنەوە، ئەلەتریک داگیرساندن.
چەرشەف کڕین، دەفر و ئامان، کتێب.
دەست و مەچەکت تەیار بۆ کار و فرمان.

ئەوان لە ژوورێیش کار و فرمانیان پێ کرا،
بەڵام زانست لەبیر کرا.
پارەشت نییە.
کەوتنە ناو قەرز و قوڵەیشەوە خەتەرە.
بەچی، لە کوێوە، چۆن پێویستە دەست بەبنیاتنانی ماڵی ئازادی بکرێ؟
دەمەوێ بڵێم،
حاڵی تانگانیکا لە حاڵی تازە لە زیندان دەرچوو دەکا.

**نامەی دەیەم**

گوێم بۆ زەوی هەڵخست،
گوێم لە خاکی ئافریقا گرت،
خوتەوبۆڵە دەهات لە ئۆگانداوە، لە مۆزامبیکەوە،
لە ئافریقای باشوور پێ پاژنە پەمەییەکان بەتوورەییەوە زرە لە زنجیرەکانیانەوە دێنن.
لێرەوارەکانی ئانگۆلا وەک شێرە سەوزەکانی لە خوێنی خۆدا گەوزیو دەنەڕێنن.
ئیمپریالیزم وەخۆ کەوتووە دوا شەڕ و گەڕی بەکار دێنێ،
بەڵام چەکداری، زیندانەکانی،
سەر بەوالییەکانی.
سەرم هەڵبڕی سەیر دەکەم:
ئافریقا لەسەر دووڕیانێ وەستاوە،
ڕێگا هەیە گرگر دەچێتەوە بۆ هەڵدێری کۆیلەیەتی،
ڕێگا هەیە دەچێتەوە بۆ برایەتیی گەورەی ئازادیی گەورە...

واتە دەمەوێ بڵێم،
هاوسەرۆکە ژیرە شۆخەکەم،
نامەی نۆیەمم جارێکی تریش بخوێنەوە.
خۆ تۆ بێ ئەوەی بگوترێ لەب، لە لەبلەبی دەگەی.
هێندەی، کە نایزانی، ئارەزووی چاوپێکەوتنتم هاتووە مۆسکۆییەکەم،
تولیاکۆڤام!

ڕەشەمێی ١٩٦٣ تانگانیکا

# نامه بۆ ژنەکەم

نازم حیکمەت

١٩٣٣/٩/١١

بۆرسە
بەندیخانە
دەنکەکەم،
لە دوا نامەتدا،
دەڵێی،
«سەرم دێشێ
دڵم هەڵدەشێوێ».
دەڵێی
«بێتو هەڵتواسن
تۆم لە دەس چی»
«ناژیم»
دەژیت ژنە خنجیلانەکەم،
یادگارم وەکو دووکەڵێکی ڕەش لەگەڵ
بادا بڵاو دەبێتەوە،
دەژیت، باجیە قژ سوورەکەی دڵم،
ئازاری مەرگ

لە خەڵکەکانی چەرخی بیستەمدا
ئەوپەڕەکەی هەر ساڵێک دەکێشێ
مردن،
مردووێکی بە پەتەوە هەڵواسراو،
دڵم بەم جۆرە مردنە قایل نابێ،
بەڵام،
دڵنیابە خۆشەویست،
ئەگەر دەستی تووکنی ڕەشی وەکو جاڵجاڵۆکەی
قەرەجێکی بەسەزمان،
پەتی سێدارەی لە ملم کرد،
بۆ ئەوەی لە چاوە شینەکانمدا
ترس بەدی کەن،
بێهوودە دەکەن
تەماشای نازم!
من،
لە تاریک و ڕووندا، لە دوا بەرەبەیانمدا
دۆستەکانم و تۆ دەبینم و
تەنیا،
ئازاری گۆرانییەکی نیوەچڵ
دەبەمە ژێر خاکەوە.
ژنەکەم، ژنەکەی من،
دڵ و دەروون چاکەکەی،
ڕەنگ زێڕەکەی،

چاوەکانی لە هەنگوین بەتامترە مێشەنگەکەم،
بۆم نووسیبووی،
داوای لەسێدارەدانم کراوە،
دەعوا هێشتا لە یەکەم هەنگاویدایە و
سەری پیاویش هێشتا وەکو شێلمێک
هەڵناکێشن.
لەمانە گەڕێ پیاو، هەمووی فشەن،
ئەمانە ئیحتیمالێکی دوورن،
ئەگەر پارەت هەیە،
دەرپێیەکی فانیلەم بۆ بکڕە،
باداریەکە قاچ و قولی کۆڵەوار کردووە،
لە بیریشت نەچێ کە
ژنی بەندییەک
دەبێ هەمیشە بیر لە شتی
چاک بکاتەوە.

پاشکۆی عێراق، ژمارە ١٥، ١٩٧٨/٨/٢١

## نامەی حەوتەم بۆ تارانتا بابوو

من دەزانم،
ئەو پرسانەی،
وەکو شووشەی،
قەپات،
لەسەر ڕەفەی
مێشکت
ڕیز کراون،
لە پێنج، شەشێکان،
پتر نین..
تۆیەکی وەک هەر پرۆفیسۆرێکی حوقووقی دەوڵەتان
نەخوێندەوار و کوێرەوار...
وێرای ئەمەش
ئەگەر بێتو لێت بپرسم
بڵێم ئەمن:
«ئەگەر هاتوو بزنەکانمان،
مووە لوولەکانیان هەڵوەرین،
شیری وەکو دوو تیرێژ تیشک
لە گوانی دوو گۆیان بڕا
پرتەقاڵمان یەکە یەکە وەک ساوای ڕۆژ

بەدارەوە وشک بوونەوە،
نەهات بەپێی ئێسکانیەوە،
وەکو قڕالی خۆماڵی
بەخاکماندا بێتو ڕەت بێ
تۆ چ دەکەی؟
تۆ پێم دەڵێی:
– «وەک شەوێکی بەئەستێرە،
لەگەڵ گزنگ چۆن تا دێ ڕوون دەبێتەوە.
دڵۆپ دڵۆپ منیش بۆیەم لە دەست دەدەم
تنۆک تنۆک کاڵ دەبمەوە».
تۆ پێم دەڵێی:
– «پرسیاری وا لە ژنێکی ئافریقایی دەکرێ هیچ؟
نەهات مردنە،
هات دڵخۆشی...
بەڵام ئەمە چ حیکمەتێکە تارانتا بابوو.
ئەمە لێرە سەرلەبەری ئاوەژووە!
دنیا لێرە فرە سەیرە
بەهات دەمرێ
بەنەهات دەژی
مرۆ نەخۆش، وەک گورگ برسی
لە وارشەکان دەخولێتەوە.
عەمبارەکان کلیل دراون
عەمبارەکان پڕن لە گەنم

خۆ کارخانەکان دەتوانن
لەگەڵ قوماشی هاوریشما
ئەو ڕێگەیەی لە زەوییەوە بۆ ڕۆژ دەچێ
ئەویش بچنن.

ئینسانەکان پێخاوسن
ئینسانەکان ڕووت و قووتن...
دنیا لێرە هێندە سەیرە
ماسی قاوە دەخواتەوە
منداڵ شیری دەست ناکەوێ
خەڵکی بەقسە بەخێو دەکەن
بەراز شەق لە پەتاتە هەڵدەدا.

پاشکۆی عێراق، ژمارە ٢٥، ساڵی ١٩٧٩.

# بۆ کوڕەکەم

نازم حیکمەت

هەبوو نەبوو، کوڕم، سێ هەرزەکاری هاوبالا و هاوتەمەن هەبوون، هەریەکە لە سووچێکی سێ سووچەی لێک دووری سەر زەوی بوو، کوڕم، هەرسێ هەرزەکاری هەریەکە لە سووچێکی سێ سووچەی لێک دووری سەر زەوی نەیەکتریان دیتبوو، نەناو و شان و شکۆی یەکدییان بیستبوو.

ئەم سێ هەرزەکارەی کە هەریەکەیان لە سووچێکی سێ سووچەی سەر زەوی دەژیان، بۆ دۆزینەوەی بەردی (لەششاغی هەتاهەتا) لە ئان و زەمانێکدا، لە یەک ڕۆژدا، لە یەک ساڵدا، لە وڵاتی خۆیان بەڕێ دەکەون، کوڕم!

مەڵێ، بەردی (لەششاغی هەتاهەتا)ش لە پشت چەندیناوچەندین لێ ناکەوێ.

چیای گەردن کەشەوە، لە نێو بیرێکی خوێناویدا بووە. بۆ دیتنەوەی بەردی (لەشساغی هەتاهەتا) کە لە پشت چەندیناوچەندین چیای گەردن کەشەوە لە نێو بیرێکی خوێناویدا خۆی شاردبووەوە، هەرسێ هەرزەکارەکە، کە هەریەکە لە وڵاتێکی دوور لە وڵاتی ئەوی تریان دەژیا، ملی سێ ڕێگەی لێک جیاواز دەگرن، کوڕم.

یەکەم هەرزەکار دەڕوا، دەڕوا هەتا کاڵە ئاسنینەکەی و گاڵۆکە ئاسنینەکەی دەستی هێندەی شووڵەبییەکی باریکیان دەمێنێ، لە نیوەی ڕێگە دادەنیشێ دەڵێ:

با تۆزێ پشووێک بدەم، کەمێ ماندوویێتیم بحەسێتەوە.

یەکەم هەرزەکار بۆچی لە تاو ماندوویێتی نابۆرژێ و خپ خەوی لێ ناکەوێ.

لە پاش ماوەیەک یەکەم هەرزەکار چاوی هەڵدێنێ کورم، بەڵام چ ببینێ، تەماشا دەکا کچێکی دەست و پەنجە بەخەنەی چاو بەکلی جوانی جوانان لە ژوورسەری وەستاوە. کچە دەپرسێ: «ئۆغر بێ، هەرزەکار، ئەوە بۆ کوێ دەچێ؟» هەرزەکار لە وەڵامدا دەڵێ:

«لە بەردی لەشساغی هەتاهەتا دەگەرێم». کچە دەڵێ: «بەردی لەشساغی هەتاهەتا لە پشت چەندیناوچەندین چیای گەردن کەشەوە، لە نێو بیرێکی خوێناویدایە. ژیان هێندەی بەبەرەوە نییە بەشی گەیشتن بەوێ بکات. ژیان پێنج و دوو رۆژێکە، پێویستە بەخۆشی و کامەرانی بیگوزەرێنی، تۆ مێشەنگ و من گوڵ، وەرە لەگەڵمدا بمێنەوە هەنگوینەکەم بگرە».

یەکەم هەرزەکار سەری شۆر دەکا، کورم، لە نیوەی رێگە دەمێنێتەوە. هەرچی دووەم هەرزەکار دەبێ دەروا دەروا، دەروا، دەروا، دەڵێ نەبادا ماندوو ببم و خەو بمباتەوە چەقۆکەی دەردێنێ لەشی لە چەند لاوە بریندار دەکا و خوێیەکی زۆر بەبرینەکانیەوە دەکات.

دووەم هەرزەکار ئێش و ئازارەکەی لەوەدا نابێ، برینەکانی زۆر دێشێن، هەرزەکار، هەرزەکار بۆچی ماندوویێتیت لەبیر ناچێتەوە، بەڵام لە تینووان زمانی بەمەلاشوویەوە دەنووسێت. دووەم هەرزەکار هێندەی تینوو دەبێ، کورم، لە پر، لەوبەرەوە چاوی بەئاوێک دەکەوێ خۆی پێ ناگیرێ رادەکا بۆ سەر ئاوەکە. ئاوەکە لە ژێر تیشکی رۆژدا وەکو زێر چریسکەچریسک دەچریسکێتەوە. دووەم هەرزەکار فرێک ئاوی زێر دەخواتەوە، هەناوی وا فێنک دەبێتەوە کورم، ئیدی جارێکی تر ئەو سەراوە بەجێ ناهێڵێ و لە دوو سێیەکی رێگەدا دەمێنێتەوە.

یەکەم هەرزەکار لە نیوەی رێگە، دووەم هەرزەکار لە دوو سێیەکی رێگەدا دەمێنێتەوە. ئینجا با هۆدەینەوە سەرەوکاری سێیەم هەرزەکار، بزانین ئەو چیی بەسەر هات؟ سێیەم هەرزەکار هەر دەروا، هەر دەروا، تینووی دەبێ لە

ئاوی چریسکەداری سەر ڕێگە ناخواتەوە، ماندوو دەبێ لەسەر ڕانی دەست و پەنجە بەخەنەی چاو بەکلی جوانی جوانان ناحەسێتەوە...

هەر دەڕوا، هەر دەڕوا، هەر دەڕوا، هەر کەسێ وا بڕوا کوڕم، دەگاتە جێ.

دە تۆش وەکو ئەو، بێ ماندووبوون، تۆش وەکو ئەو بێ تینووبوون، تۆش وەکو ئەو بڕوا بکە و بڕۆ، کوڕم.

خاوەن بڕوا دەگاتە ئەنجام.

پاشکۆی عێراق، ژمارە ١٧ی تەمووزی ١٩٧٨

## بۆ نووسیارانی ئاسیا - ئافریقا

نازم حیکمەت

١٩٦٢

براکانم،
مەڕواننە ئەوەی قژم زەردە،
من ئاسیاییم.
مەڕواننە ئەوەی چاوم شینە،
من ئافریقاییم.
دار و درەختەکانی ئەوێی من
سێبەریان بۆ ژێر خۆیان نییە کوتومت وەک
ئەوانی ئەوێی ئێوە.

لە وراگەی من نان لە دەمی شێردایە
سەرچاوە حەزیای لەسەر دەنوێ
پانپانکی لەسەرە.
پێ لە پەنجا نانرێ دەمرێندرێ لەوێ
کوتومت وەک ئەوانی ئەوێی ئێوە.
مەڕواننە ئەوەی قژم زەردە،
من ئاسیاییم.
مەڕواننە ئەوەی چاوم شینە،

من ئافریقاییم.
لە سەتا هەشتای ئەوانی من نەخوێندنەوە دەزانن،
نەنووسین.

شیعر دەماودەم دەگێردرێ، بەگۆرانی دەگوترێ
شیعر دەتوانێ لەوێی من ئالآ پیرۆزە بکا
کوتومت وەک ئەوانی ئەوێی ئێوە.

براکانم!
دەبێ شیعرەکانمان بەگەڵ گاریوەڵە کەون
جووتیان پێ بکرێ
دەبێ بتوانن بچنە نێو زۆنگی مەرەزەوە
تا چۆکان.
دەبێ بتوانن هەموو پرسیارێ بکەن
دەبێ هەموو مەشخەڵێ بتوانن خڕ کەنەوە
دەبێ بتوانن لە سەرەڕێیان بوەستن
دەبێ شیعرەکانمان وەک کێلەڕێی کیلۆمەتر خوێنەوەکان بن
کە دژمن نزیک کەوتنەوە بتوانن
بەر لە هەرچی بەدییان کەن
دەبێ بتوانن لە ناو جەنگەڵستاندا لە تەمتەمان بدەن،
ئەوەی لەم سەرزەوییە دیلە،
تەنیا وڵاتە،
تەنیا مرۆ.
تا گەواڵە هەورێکی بەئاتۆم بەئاسمانەوە بمێنێ

دەبێ شیعرەکانمان سەروەت و سامانیان،
ئاوەز و بیریان، ڕۆح و گیانیان، هەرچییان هەیە و نییە،
بەئازادیی گەورەی بدەن.

نووسەری کورد، ژمارە ١٢، خولی دووەم، ئابی ١٩٨٣

# چەرخی نووسەرانی بوێر و ئازا

یەشار کەمال

ئێمە چ دەڵێین؟ دەڵێین یەکسانی هەبێ. ئینسان وەکو دیل نەژی. مرۆ ئازاد و سەربەخۆ بێ. توخوا، بۆ نووسەرێکی ئەم چەرخە چی شتێ لەمە ئاساییتر دەبێ؟ چی لەمە خاوێنتر و پاکتر هەیە. تێکرای نووسەرانی بێ دەسەڵاتی دنیا داوای ئەمە دەکەن کەچی کەسیش پێیان نالێ ئێوە چ دەکەن و برۆ بە سەر چاوتانەوەیە. سەد سەد و پەنجا ساڵە نووسەران داوای دەکەن. نووسەران زمانی حاڵی میللەتانن. نووسەران هەمیشە، سەبارەت بەو ئەرکەی لە ئەستۆیانە، زۆریان کاری گەورە کردووە و دەشیکەن. چالاکیی بەرچاویان زۆر نواندووە و دەشینوێنن. کێشەی وڵاتی ئێمە، لە چاو کێشەی وڵاتانی دیکە، کێشەی بە ئاشووب و سەر بەگۆبەندە. نووسەری ئێمەش لە سۆنگەی ئەم ئەرک لە ئەستۆگرتنە دەیەوێ –با هێندەی مێرووییەکیش بێ– شتێک بە شتێک بکا، خۆ دنیا خراپ نابێ.

ئینسانەکانمان دیلی خاکن. بەشێکی زۆری خەڵکەکەمان تا ئێستاش لە خانووبەرەیەکدا دەژین کە لە ئەشکەوت پتر دەچن تا شتێکی دیکە. فەرموو بچنە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ. بە هەزاران گوند دەبینن خانووەکانیان لە ژێر زەویدان. ئێمە دەمانەوێ ئەم خانووانە لە ژێر زەوییەوە سەرکەونە سەر زەوی و بەر رووناکی. خواستەکەمان خواستێکی زۆر چکۆڵەیە. تۆ بڵێی وەسەر زەویخستنی ئەمانە کارێکی هێند سەخت و دژوار بێ؟ ئی وا لە نێو ئینسانانی وڵاتانی ئێمەدا هەن کە هێشتا لە نێو بەرد و تاوێری کۆڵراودا دەژین.

هەموو دنیا جاری پێشکەوتوویی وڵاتی ئێمەی داوە و لەو ناوە بارەی دێ. بۆ کەس ماوە بە لیستەی راستەقینە و ژمارەی تەرازوو کراوەوە لە دواکەوتوویی ئێمە نەخوێنێ؟ چ دەخۆین، چ دەخۆینەوە، لە کوێ دەنووین، هەموو دنیامان تێ گەییون.

ئێمەش خۆمان ئەمە دەزانین و نکووڵیی لێ ناکەین و لە هەموو دەرفەتێکدا دەیدرکێنین و دەڵێین و هاوار دەکەین بابە ئێمە وڵاتێکی دواکەوتووین. خۆ هەر ئێمە هاوار ناکەین. گەورەپیاوان و دانا و زاناکانیشمان دەیڵێن.

ئەمە هەموو جوانە، زەریفە، بەڵام هەر کە ئەمەت بە چیرۆکێ نووسییەوە دنیا وێران دەبێ. خۆ ئەگەر بۆ شانۆت نووسی ئەوە هەر باسی سەرتە و رۆژی حەشرە. خۆ سینەما، ئەوە هەر باسی مەکە. هەرکە لێی نێزیک دەکەوییەوە و ناکەویتە تارماییی رەقیبت وەکو هەیوولا، وەکو شتی نابینا، بێ هەناسەدان لەبەر مێشکا دێ و دەچێ.

بەڵێ تێکرای نووسەرانمان بەرەنگاری گرفتاری ئەمەن. کە بەرەنگاریشیان دەبن چ دەبێ و چ دەقەومێ؟ ناچار لەگەڵ کۆنەپەرستی و رژێمدا دەستەوبەرۆکی یەک دەبن و کارەساتێکیان بەسەر دێ با بەسەر دەواری شڕی ناهێنێ.

جا لەم بەینەدا خەڵک چ دەکا؟ دنەی نووسەران دەدەن و ورەی مێرخاسی بوێرییان وەبەر دەدەن. بەکورتی بە پاڵەوانیان لە قەڵەم دەدەن. کێش و ترازووی نووسەرێتی دەپێچرێتەوە، تەنیا کێش و ترازووی مێرخاسی و ئازایەتی لە ئارادا دەمێنێتەوە.

«کورە تۆ تەماشا تەماشا، نووسەر چ چیرۆکێکی بۆ شانۆ نووسیوە. بابە ئەگەر ئەم نووسەرەیان لەسەر ئەم چیرۆکە لە زیندان نەپەستا من دەستی خۆم لە بندا دەبڕم. بەراستی نووسەرە. بەڵام چ نووسەرێ. ئاغاکانی بەدەردێ بردووە، نەبووە و نەبیستراوە. پەروای لە هیچ نییە، لە هیچ ناسڵەمێتەوە. مل لە چەقۆ دەسوێ.»

«بنۆڕە بنۆڕە، چ ریپۆرتاژێکی نووسیوە... ریپۆرتاژە ها، نە گاڵتە. چ لەمە سەیرتر دەنووسرێ، باسی ئەو کەسانەی کە بێ تێ و لەرز دەمرن، یا ئەوانەی کە لە ژێرەوە هەمیشە خەریکی دزی و درۆزنین وا دەکا، وەک بڵێی ئەم نووسەرە گوڵمەزێکی بە چاوەوە بێ وایە.»

«فیلمێکی هێند سەیرە پێم وایە رەقیب قەت فیلمی وا رێگا نادا... بڵێ چییان کردبێ باشە. گوندیی پێخاوس و مێخاوسیان پیشان داوە. ئەی ئافەرین بۆ خۆتان و فیلمتان. بەڕاستی ئازایەتییە.

تۆ وەرە، لە پێپەتیی پیشاندان نەترسی» جا بەڕاستی نووسەرەکانمان وەکو لە سەرەوە باسمان کرد بە مەتح و بە شان و باهوو هەڵدانا پێشوازی دەکرێن.

نووسەرەکانمان ئەگەر سەبارەت بەوانەی لە سەرەوە وتمان بۆسۆ و ناونۆچک نەکرێن، ئەوەی بەسەریان دێن بەسەریان نەیەت، بەگوێرەی خواست و ئارەزووی خۆیان، بەو داخواز و پێشنیارانەی کە بۆ راستینەکانی وڵات دەری دەبڕن بنووسن، ئەگەر نووسینی ئەمانە بە کردەوەیەکی ئاسایی بزانرێ کەس بە نووسەرانمان ناڵێ قارەمان و بە چاوی پاڵەوانەوە سەیریان ناکەن. نووسەران قەرزی خۆیان دەدەنەوە. ئەرکی سەرشانیان بەجێ دێنن. دەڵێن نووسەر کاری خۆی دەکا و دەڕوا.

بەڵام ئەوەی لە دنیادا بە قەرزدانەوە و ئەرک بەجێهێنان دەزانرێ بۆ نووسەر لە وڵاتی ئێمە مایەی بۆسۆکردن و تێهەڵدان و زیندانکردن و برسێتییە و دەڵێی بە ئازار و ئەشکەنجەدان تۆڵەیان بۆ دەکرێتەوە. جا هەر سەبارەت بەوەشە کە خەڵک وا دەزانن لەبەر ئازایەتی دەگیرێن و خۆشەویستن.

با هەر شانازی بەخۆیانەوە بکەن. بەقارەمان و پاڵەوان بزاندرێن. کێشەم لەسەری نییە. دەڵێم سەرەڕای ئەوەش هێشتا هەر کەمە. دەڵێم خەڵک هیچ نادا. بەڵام ئێمە، نووسەران، بەرانبەر ئەم حاڵە، شەرممان بە خۆدا دێتەوە.

ئایا بە چ ڕەنگێ خەڵکەکەم لەم حاڵە ڕزگاریان دەبێ؟ زۆرمان ڕێگای چارەسەرکردنی زانستییەکەشی دەزانین و دەیڵێین و دەیڵێینەوە. فێرگەمان نین. هەشتا لە سەدمان نەخوێندەوارین. دەڵێن بە ئەزموون ساغ بووەتەوە تا فێرگە لە گوندان نەکرێتەوە خەڵکەکە فێری هیچ نابن.

لێرەوارەکانمان بەرەو نەمان دەچن. خۆ وەنەبێ پیاوی زانامان نەبن. بەڵکو زۆریشمان هەن و تەنانەت ڕێگای چارەسەرکردنیشی زۆر چاک بەڵەدین. بەڵام لە هەمووی تاڵ و ناخۆشتر ئەوەیە کە کەس هەست بە پێویستی چەنە – چەنێکیش ناکا. دەڵێی قسە لەگەڵ دار و بەرد دەکەین. ئاغاکانمان قایمقامەکان بۆ سوودی خۆیان لێ دەخوڕن. ئێمە ناچارین مەسەلەکە بەو ڕەپ و ڕاستی و رووت و قووتییە وەپێش چاو خەین. کوڕە نەبووە نەبووە، وا دنیا وێران دەبێ، کەچی ورتە لە کەسەوە نایەت.

ئێمەش هەر هێندەمان بۆ ماوەتەوە بەگژ کۆنەپەرست و کاری چەوت و چێڵی میریدا بچین و لە ئاکامدا لە زیندانێمان پەستن.

ئەم وڵاتە جوان و خۆشەیان لێ کردووین بە یاساخخانە و وڵاتی ڕەشبگیری، تووشی یاساخیی هێند سەیروسەمەرە دێین. تەنانەت کەرەپووی کەرەپوو ئاساییش پڕ ناکاتەوە. هیزە بەچاوەوەی نەکەن، ئەم وڵاتە لە سای سەری ئەم هەموو یاساخ و ماساخەوە بەم ڕۆژە گەیشت. جا لە هەمووان سەیروسەمەرەتر ئەوەیە ئێمە هەر پەڵەی ڕەشی نێوچاوانی چەوت و چێڵی دەژمێرین. کەچی کەسمان وەچنگ ناکەوێ هیچ نەبێ پێ بکەنێ. ئێمە لە هیچە و لە خۆڕایی داخی دڵی خۆمان هەڵدەڕێژین.

خۆ هیچ نەبێ ئەو نووسەرانەمان کە چاکن و بە گوڕن و خاوەنی سۆزێکی ڕاستەقینەن، دنیایەکی جوان و ڕەنگینمان پێشکەش دەکەن. ئێمە زۆر نووسەری وامان هەن. نووسەرانی ئێمە بە گوڕێکی گەورەوە بەسەر ڕاستینەکانی خەڵکەکەماندا، وڵاتەکەماندا دانووشتاونەتەوە.

با ئیتر باسی برسێتی و یەکسانیکردن بە ئازایەتی و دلێری زانین

بپێچرێتەوە. پێویستە ئەمە ببێ بە یەکەم ئەرکی نووسەر.

نووسەرێک کە باسی یەکسانی و هەژاری دەکا، بەگژ چەوساندنەوە و زۆرداریدا دەچێ. ئەمە لەم چەرخەدا شتێکی یەکجار ئاساییە.

ئەوەی کە ئەمە بە ئەرک نەزانێ دیارە ئەوانەش بە نووسەر نازانێ کە ئەرکی مرۆڤایەتی و هاووڵاتێتییان لە ئەستۆ گرتووە. جا نابێ لە وڵاتی ئێمەش وابێ؟ کوا؟

رۆژێ کە ئەمانە دەبن بەشتی ئاسایی، رۆژێ کە نووسەرانمان قسە لە راستینە نیشتمانییەکانمان دەکەن جا با قسەکانیشیان زۆر تاڵ و جەرگبڕ بن، ئەگەر تووشی بەڵا نەهاتن، واتە: رۆژێ کە چەرخی نووسەرانی ئازا و قارەمان بەسەردەچێ ئەوە لەو دیموکراسییەتە نێزیک دەکەوینەوە کە شانازیی پێوە دەکەین.

لەوانەیە بڵێن چەرخی نووسەرانی ئازا و بوێر لە هیچ وڵاتێ بەسەر ناچێ.

بەڵام من دەڵێم باسکردنی یەکسانی و راستینە نیشتمانییەکان لەم چەرخەدا شتێکی ئاساییە و بۆ نووسەرێ وەکو نان و ئاوی لێ هاتووە، نابێ بە کارێکی ئازایانە و کەڵەمێردانە بزانرێ.

پێویستە لە پێناوی ئەمەدا تێ بکۆشین.

بەیان ژمارە ٣٣، ١٩٧٦

# شیری ماین

یەشار کەمال

مــرۆ ئاگــری لە شـت کــوڵینـەوە و ڕازهـەڵـینان و هـەرکـە هـەڵیــشی هێنا لە خۆشییان وەک شێت لێ هاتنێکی – تێدایە.

ئێمـە کە بەدیداری ئـەم دنیای ئەمڕۆمـانە شاد و شـوکور بووینەتـەوە، هەموو لە سای سـەری ئەم ئاگرەوەیە. لە سای سـەری هێز و گوڕی ئەم ئاگرەوەیە کە ئاڵقە لە گوێی فەرمانان نییە.

بەڵام مرۆ هێندێ لایەنی دژ بەو ئاگرە پیرۆزەیشی تێدایە، بەڵای خـوام لێ دا، زۆر بڵـــحـــە. ئەم لایەنـەی تێــیـــدان، بوون بـە سنـدمی دەست و پێی. بۆ شکاندنی ئەم سندمـەیش ڕەنجێکی زۆری بەبا داوە. ئەم سندمـە نەبوایە، مرۆ لە شـەڕ و شـۆڕشـی داهێناندا، لە ڕازهەڵێنـاندا، بەگژ ئەو چەڵەمـانەی لە پێی ئالاوون، چووبا، لەوانە بوو دنیـا شـتێکی تر بوایە و ئەم شـوێنەی پێی دەڵێن مانگ زۆر زووتری پێ گەیشتبا.

مرۆ سـالانی سـاڵ بـە لاس و پەلاسدا دەچێ، شـەڕ دەکا، تا یاسـا و دۆزێ پێکەوە دەنێ. دامـــەزراندنـی ئەو یاســا و دۆزە ســالانی ســاڵی دەوێ. ئـەمـە کارێکی چاک نییە؟ زۆر چاکە. لە پاش ماوەیەک ئەو یاسا و دۆزە کۆن دەبێ، دەوری بەسـەر دەچێ. کـە یاسا و دۆز کۆن بوو، جـارکێشـانی یاسا و دۆزی تازە، شـــۆڕشگێـڕانـی یاســـا و دۆزێکی نوێبــاو دەست بەدەرکــە لە تەپان و گرێژەنە دەرێنان دەکەن. لە نێو خۆیاندا بەشـەڕ دێن، یاسـا و دۆزپەروەرانی کـۆن دەبەزن، بەڵام لەپاش چی... لەپاش ئـەوەی کـاری زۆر چاکـیـان لـەدەست دەچی...

ئینســانانی ئەو شــوێنەی پێی دەڵێن ڕۆژاوا گــورج و گــۆڵانەتر وەخــەبەر هاتوون. گوتوویانە ئێمە خەریکی چین؟ یانێ چی بەپاشەوە نووساوین، هۆ هۆ ئینسانینە لە هەر ڕازهەڵێنانێکی تازە، لە هەر بیر و ئەندێشەیەکی نوێ چاکە و خێروبێرێکی گەورە و زۆر و زەوەندەمان بەگیر دەکەوێ. ئەوانەی لە هەموو ڕووێکەوە داکۆکی لە بیر و ئەندێشەی نرت و نوێ دەکەن زۆر بوونەتەوە. جا ڕۆژاوا لە هەموو مەیدانێکدا پێش کەوتووە و بەرەو پێشەوە دەڕوا...

مرۆ هەر هێندە لە بیروبڕوای پێوە قاڵب گرتوو بەدەر نەختۆکەیێ، بیری کردبێتەوە کاری کراوە... ئەدی چەرمیان نەگوروە، چاویان دەرنەهێناوە، چی و چییان لێ نەکردووە. هەر بۆ ئەوەی نەبادا داهێنانێکی نوێباو، بیرێکی تازە لە کـەلێنێکەوە بەناو وڵاتەکـەیاندا بـتـەنێـتـەوە، پێکدا هەڵپـڕژاون، بەلاس و پەڵاسـدا چوون، چونکە بیـری نوێ، ڕازهەڵێنانی نـوێ، یاسـا و دۆزی کۆنـیـان ژێر و ژوور دەکـا، سـەراسـوودەییی بڕێ ئینسـان دەشـێـوێنێ. کـار لەوەش خراتری لێ هاتووە. یاسا و دۆزیان وا شێواوە، بەڵام چ شێوانێ! ئەو ئینسانە ڕۆژاواییانەی کە بەکۆڵێ داهێنانی نوێ و بیری نوێوە هاتوون، ورد و باریک ئەوانیان کردووە بەبەندەی ئاڵقە لەگوێی خۆیان. ئێمە بەهێندێ جۆرە سەر و مێشکمان گوت سەر و مێشکی ڕۆژهەڵات. گوتیشمان هەی بەبڕین چێ. جا ئەم سەر و مێشکە بەبڕین چووە، لە پێشان هەرچی داهێنانێکی تازە، ڕۆژاوا دای هێنا لە گژی ڕاچوو. نزیکەی سەد ساڵێ بەگژیدا چوو. ڕۆژاواییەکان ئەم تازە ئیجاتانەیان، چ بەزۆر چ بە خـوایشت، بەهەر جۆرێ بوو بەلالوێچێ ڕووناکبیری وڵاتە ڕۆژهەڵاتەکان سەلماند. ئەوانیش تەماشایان کرد، خراپ نییە. یاسـا و دۆزەکـە نەختـۆکەیێ شـیـرازەی تێک چوو، بەڵام کـەمۆکـەیێ. ئەوەندکۆکـە عـەیبـە لە کیژی قـازییش دەگیـرێ. سـواری شـەمـەندەفـەر بوون، سـواری پاپۆڕ بوون، سـواری فـڕۆکـە بوون... بەدیداری کـارەبایش گـەیشتن. ڕۆژاوا ئەو هەموەی پێ بەخشین. کەچی ئەوان هەر لێی بەلادا کەوتوون و لە خرپەی خەودان.

ڕۆژاوا ئێـســـتـــاکــە وا بەدوای کـــاروبارەوەیە. وا شـــۆڕشـــێکی تر

هەڵدەگیرسێنێ: ئاتۆم دروست دەکا، یەک. خۆی بۆ چوونە سەرمانگ ئامادە دەکا، دوو. شتێکی تر دەکا[1]، ئەمە لە هەمووی گرینگترە: دژ بەمرۆ بەدەست مرۆ چەوسانەوە ملی لە شۆڕشێکی بەسام ناوە.

ئینسانانی بەرەی هێزی پێشکەوتەی ئەم شۆڕشە بەسامە هەموو ڕۆژێ شتێ پتریان وەچەنگ دەکەوێ، بەڵام سەر و مێشکە ڕۆژهەڵاتییەکە، بەبڕین چێ، هەر بۆ ئەوەی، نەوەکا یاسا و دۆزەکە کەلێنێکی تێ کەوێ، گیانی خۆی بۆ بەخت دەکا و لە دژی گۆڕانەکەیە...

ئینسانانی ڕۆژهەڵات برسی، ڕووت، پەرێشان، بۆ پاروێک خۆیان بەدار و بەردda دەدەن.

بڕوانن برسێتی لەم ئەنەدۆڵە ڕۆژهەڵاتەدا چ کارێ دەکا. هی وا هەن، دەڵێن بەپیتاک و باربووکردن بەری لێ دەگرین. من هەر لە ئێستاوە پێتان دەڵێم. ئەنەدۆڵ وا بڕوا، خەڵکەکە لەگەڵ ئەم برسێتییەدا ساڵانی ساڵ دەستەوبەرۆک دەوەستن.

مێشکی ڕۆژهەڵات چارەسەرێ بۆ ئەمە نادۆزێتەوە. لە چارەسەر گەڕان، چارەسەر دۆزینەوە دەبێتە بەهای سەر لێشێوان و هەرەسهێنانی یاسا و دۆزی ئەمرۆکە. خۆ مێشکی ڕۆژهەڵاتیش ناشکوری نەبێ هەروا لە خۆیەوە یاسا و دۆز ناشێوێنێ... شەقڵ و مۆری ناشکێنێ... دەبا نەیشێوێنێ، پیاو. من خۆم لە قەرەی ئەو لایەنەی نادەم. جا وڵاتەکەی ئێمەیش وا لەم بارەدا و دەستەیێ کۆنەپەرست، کە گۆیا میللییەتچی، توورانچی، مقدساتچییان پێ دەڵێن، پەیدا بوون.

ئەمانە چ بڵێن باشە؟ ئێمە ڕەگەزپەرستین، میللییەتچین. چاکە، خاسە، بڕۆن بن. کارێکی لەبارە. ڕەگەزی تورک لە سەرووی هەموو ڕەزەکانەوەیە. سەردەمانێ ئەمەیان بەتەک گورگە دەم داپچڕلوەکەوە لەسەر بەرگی کۆواران دەنووسی. ڕەگەزی تورک لە سەرووی هەموو ڕەگەزەکانەوەیە، نییە، ئەوە

(١) ئەم وتارە لە ١٩٦٢/٢/٢٨دا بڵاو کراوەتەوە. وەرگێڕ

نازانم. پیاوانی زانست ئەم کاری ڕەگەزپەرستییەیان کرد بەدۆ و دۆشاو. پەڕ و باڵی پێشکەوتیان پێوە نەهێشت. ئێستا ئەم ئینسانانە، سەرباریش، دەڵێن، ئێمە موسڵمانین، مقدەساتچین. لە موسڵمانەتیدا هیچ موسڵمانێ لە سەرووی هیچ موسڵمانێکی ترەوە نییە. سەرلەبەری موسڵمانان، لە هەر ڕەگەزێ بن، بران.

کەواتا ئەمانە یا ڕەگەزپەرست نین یا موسڵمان نین. ئەمانە درۆزنن. ئەمانە ئەو کۆنەپەرستانەن کە پاشکەوتەیی میللەتیان دەوێ، بۆ سوودی خۆیان، نەشێوانی یاسا و دۆزیان دەوێ. ئەمانە لەگەڵ ئەو ئاغایانەشدا کە لە دژی یاسا و دۆز شێوانن یەکیان گرتووە، ئەمانە هەر ئەو کەسانەن کە لە دژی شۆڕشی ڕزگاری دەستیان لەگەڵ دژمندا تێکەڵ کرد.

شازدە حەڤدە ساڵان بووم، سەردەمێ شیعرم دەنووسی توورانچی، ڕەگەزپەرست، میللییەتچی چ بوو سەرەوەدەرەم لێ دەرنەدەکرد. قوتابخانەکەشمان بزاوتێکی توورانچێتیی ئاواوایی تێدا هەبوو.

توورانچییەکان بەدوو جۆر کاریان دەکرد: بەمنداڵە هەژارەکانیان دەگوت، تەماشای ئەم دەوڵەمەندانە بکەن، تەماشای کۆشک و تەلار و ئەپارتمانیان بکەن سەیری کێڵگە و بەرەجووتەکانیان بکەن و ئاورێکی ژیرانەیش لە حاڵی خۆتان بدەنەوە... منداڵە هەژارەکان دڵیان دەچوونێ. هەرچی منداڵە دەوڵەمەندەکانیش بوون پێیان دەگوتن، هاورێیینە، تەماشاکەن لە دەرەوە ملیۆنان هاوڕەگەزی برسی و ڕەش و رووتمان هەن، با ڕزگاریان کەین. لەمەش پێوە هاش و هووش و پروپاگەندەشیان بۆ سایەچەوریی دەواری ڕەش و قمز و تیروکەوان و شەڕ و خوێنڕشتن دەکرد دەیانگوت، نێر ئەو کەسەیە شەڕی بووێ، مەردی کوڕی مەرد ئەو کەسەیە لە شەڕدا بمرێ. دۆڵیان دۆڵیان خوێن، خوڕخوڕ خوێن... سەرلەبەری شیعری کۆوارە گورگ دەم داپچڕیوەکانی ئەو سەردەمە خوڕخوڕ خوێناوی بوون، خوێنیان لێ دەتکا. ئەوی شەڕی نەویستبا غایەنی نیشتمان بوو.

من ئەو دەمی زمانم سووتا باسی (زەوی)م کرد، گوتم دەوڵەمەندەکان

زەویوزاریان زۆرە. ئێمە نیوە کارین. زەویوزارمان نییە. چیم بەخۆم کرد. پۆلیس کارێکیان پێ کردم با بەدەواری شەڕی ناکا. لە هاتوچۆ و چوونە ناو خەڵک کەوتم. هێندەی نەما بمکوژن. بەڵام کەس نەبوو بەتوورانچییەک بڵێ، برۆ بەسەر چاوتەوەیە. کۆوارەکانیان لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بەهۆی مامۆستاکانەوە بەفرۆتن دەدا. ئێستاکانێ چەندیان ڕوو دەدرێتێ ئەوسایش ئاوهایان ڕوو دەدرایێ.

ئەو سەردەمە شیعریشم نووسی. شیعرەکانم نیوە دێرێکی لەم بابەتەی تێدا بوو! «ئاڵایەکی سپی لەسەر خەون و خولیاکانم هەڵکەن...».

کاکە زاریان لێ داپچڕیم، وەکو گورگی هار هاشاوڵیان بۆ هێنام: تورکێ تورک بێ دەم لە ئاڵای سپییەوە دەدا؟ سپیی هامانا، ئاشتی، ئەوەی خۆی بەتورک بزانێ قەت ئاشتیی دەوێ! کە گوتت تورک، واتا خوێن.

ئێمە ئەو سەردەمانە زۆر لەو کارانە نەدەگەیشتین. جگە لەمەیش، کاکە باس هەر باسی «قمز» بوو. قمز وا و شێلە وا...

پێنج شەش هاوڕێ، لە پەنایەکەوە سەرمان بەیەکدا گرت ئاخۆ ئەم قمزە چی بێ؟ قمز پیاو مەست دەکا. ها لە پاش چەند و چەند ڕازەکەمان هەڵێنا: کە جۆرە شەرابێکە لە شیری ماین دەگیرێتەوە. یەکێ لەوانەی ئەقڵی لە سەردا هەبوو گوتی، ئێستا بەدەست ناکەوێ. بۆ ئاسیای ناوەندیش بچن هەر نییە. خەڵک ئیتر شەرابی وا ناخۆنەوە. قمز خواردنەوە ناچارییەک بوو سەردەمی بەسەر پشتی ئەسپ و ماینەوە گەڕان دای هێنابوو. ئیتر هەرچییەک بوو، دەبێ شەرابێکی زۆر خراپ بووبێ.

ئیتر هەر بەجارێ وڕ و گێژی کردین... شەرابی زۆر خراپی قمز... خوڕخوڕ خوێن... دەوجا وەرە، ئەنەدۆڵ بەم برسێتی و پەرێشانییەی خۆیەوە، هەر ئەوەی ماوە، بە تیروکەوانەوە بۆ سەفەری ئاسیای ناوەند بەڕێ کەوێ.

نووسینەکەم درێژای کێشا، دەمەوێ بڵێم، ئینسان شتی نوێباوی بەزۆر سەلماندووە. زۆر جاران لە بیر و ئەندێشەی نوێ دوورەپەرێز وەستاوە و

بەئامـان و زەمـان تـوخنی نـەکـەوتووە، بگرە بەچاوی دژمنایەتیش سـەیری کردووە.

ئێمە، منداڵی شازدە، حەڤدە ساڵە، هەر ئەوەندە نەختێ بیرمان کردەوە، تێ گەیشـتین قـمـز شـەرابێکی سـەروبەند بەسـەرچووە، نەپیـرۆزە و نـەتەڕەماش. خوڕخوڕ خوێنڕشتنی ئینسان کارێکی بڵج و بوغرنجە.

ئەنەدۆڵ بەم ڕەزیلی و سـەفـیلی و برسـێتی و پەرێشـانیـیەوە، هەڵتـەک هەڵتەک، بە تیروکەوانەوە چی لە سەفەری ئاسیای ناوەند داوە.

مـرۆ هـەر ئەوەند فـێری بیرکـردنەوە بووبووایە... چونکە کـۆنەپەرسـتـەکـان هەمیشە لە هەڵپە و هەڵوەدای ئەوەدان نەهێڵن فێرە بیرکردنەوە ببێ.

نووسەری کورد، ژمارە ١١،

خولی دووەم، شوباتی ١٩٨٣

# گفتوگۆ لەگەڵ یەشار کەمال

سازدانی: ئەردال ئۆیز

* یەشـار کـەمـال، لـەم دەمـودەسـتـەدا کـتـێـبـێکت بەدەسـتـەوە هـەیە، بیخوێنییەوە؟

– بەڵێ. سـتـاندال دەخـوێنمـەوە. (دێری پارمـا)کـەی. کێ دەزانـێ ئەمـە چەندەمین جارە دەیخوێنمەوە.

* هیچ شـتـێکی جـیـاوازت لە نێـوان ئەم خـوێندنەوەیـەی دوایی و خوێندنەوەکانی تریدا دۆزیوەتەوە؟

– هەمـیـشـە شـتی جـیاواز جـیاواز لـە سـتـاندالدا دەدۆزمـەوە. سـتـاندال نووسەری سەرەکیمە. تۆلستۆی کە ڕۆمانە بەناوبانگەکەی (شـەڕ و ئاشتی)ی نووسـی. لە گـێـڕانـەوەی باسـی شـەڕی بۆرودینۆدا لاسـاییی سـتـاندالی کردووەتەوە. ستاندال لە (دێری پارما)دا باسی شەڕی واترلوو دەگێڕێتەوە. ئەم باسە زۆری کار لە تۆلستۆی کردووە. من ئەمەم پێشتریش دەزانی، بەڵام دوای ئەمـە، بیـروباوەڕم لـەمـڕووەوە زێتـر چەسـپی. باسی شـەڕوشـۆڕ تا سـەردەمی سـتـاندالیش تا بڵـێی زۆر سـامناکانە دەگێڕدرایەوە: گرمـوهۆڕ، هەراوزەنا، تەپوتۆز، دووکەڵی باروت، بەرپێ نەدیتن، لە کورتی، شەڕوشۆڕ، بە هەمـوو بارودیوێکیـدا قـەڵـەمی وەکـار دەخـرا. زۆر بەفـراوانی و بـەربڵاوی دەگێڕدرایەوە. وەک خـەڵک هەمـوو بارودیوێکی شـەڕوشـۆڕ بە چاوی خـۆیان ببـینن وا بـووە. کـەچی بەلای سـتـاندالەوە، شـەڕوشـۆڕ لە نیگای ژنە ئاڵووێرچییەوە، لە نیگای منداڵێکەوە دەگێڕدرێتەوە، کە بۆ چوونە بەرمەیدانی

شـــەر هـەر وەخـتـــە بووە فـراقی ڕەش بکا. سـتــاندال لە جـیـاتی، ئـەوەی ئەو شـەڕوشــۆڕانـە وەک جـاران بەو هـەمـوو بەزم و ڕەزمـــەوە بگـێـڕێتـــەوە هـاتووە، بەڕاسـتـتـر و ئینسـانانەتریـانی گـێڕاونـەوە. سـتـاندال شــەڕ، تەنانـەت باسـی لەشکرێکی گـەورە و گـرانی بەزیویش بەوپەڕی سـادەییـیـەوە دەگـێـڕێتـەوە. ئەمەیش پێم وایە لە مێژووی ئەدەبیاتی دنیـادا، بۆ یەکەم جار، ستاندال ڕچەی شکاندووە. تەنانـەت تۆلسـتـۆیش لـە گـێـڕانەوەی باسی شــەڕی بۆرینۆدا، لە ڕۆمانی (شەڕ و ئاشتی)دا هێندەی ستاندالی جوان، هێندەی ستاندالی سادە نەگێڕاوەتەوە.

تۆلسـتـۆی لە نووسـینی (شـەڕ و ئاشـتی)دا نیـشـانـەی لاسـاییکردنەوەی سـتـاندالی لە نووسـینی (دێری پارمـا)دا بە ئاشکرا پێـوە دیارە و چ گـومـان لەوەدا نیـیـە. لە هـەرتک ڕۆمـانەکـەدا تا ڕادەیەکی پڕاوپڕ، نموونەی وەک یەک، کەسـانی وەک یەک دەتوانین ببـینین. ئەسـپـەکان هەر ئەو ئەسـپـانەن کـە غار دەدەن. شتەکانی تر هـەر ئەو شتانەی تر. بێگومان ئەوانی تۆلستۆی بەرچاوتر و بەتەنتـەنە و سـەنسـەنەترن. هەرچی ئەوانی سـتـاندالن سـادەترن. سـتـاندال ئەدەبیـاتی فـەرەنسـزانی بەرەو ڕووکارێکی ڕاست ڕێ بەدێیی کردووە، وەسـەر شارێییەکی ڕاست خستووە. ئەو وەک فلوبەرت نییە. فلوبەرت قسـەیەکی هەیە، گوتوویە: «مادام بۆڤاری خۆمم».

وای گوتووە ئـەمـە قسـەیەکی ئێجگار هـەڵەیـە. لەوەتی ئەدەبیات ئەدەبیـاتە، بێگومـان، نووسـەران، سـەردەمـانێ، باسی خـۆیـان دەکردە کـەرەسـتـەی نووسینەکانیان، بەڵام ئەوە بزانە کە ئەم باسی خۆبەکەرەستـەی نووسینکردنە هیچ پێـویست نیـیـە. گێـڕانەوەی باسی دەورووبەر، خـۆی لە ناو کرۆکدا، واتە گـێـڕانەوەی باسـی خـۆ. کـە باسی ژیان دەگـێـڕییـەوە، واتە باسـی خـۆت دەگێڕێیەوە. دوشێ سـانسـێڤریناکەی ڕۆمـانی (دێری پارمـا) سـتاندال نییە. چونکە سـتـاندال، سـا هـەرچۆنێ بووبێ ئەو دەورووبەرە ژیاوە. (دێری پارمـا) گـەرچی ڕۆمـانێکی دیرۆکـانە و مـێـژووانەیە، بەڵام سـتـاندال بێ سێ و دوو دەورووبەری ڕووداوەکانی ژیاوە. ژیانی دوشێ سـانسـێڤرینا، یا یەکێکی وەک

ئەو، یا چوزانم ژیانی برێ بنیادەمی وەک ئەو ژیاوە، ئینجا دەستی داوەتە قەڵەم. واتە ستاندال ئەو ئاووهەوایەی لە ڕۆمانەکەیدا ژیاندوویە، ژیاوە. نازانم توانیم تێت گەیەنم؟ بە نموونە هەمیشە دەڵێم: هێلینا نییە هۆمیرۆس. ناتاشا نییە تۆلستۆی. چونکە بەداو و دەستووری داستانبێژی، بە نموونە لەو داستانە زاندراوانەی ئەمڕۆماندا، هیچ کاتێ کەس باسی خۆی، باسی کەسایەتیی خۆی نەهێناوەتە ئاراوە. ئەی باسی چ دەکا؟ لەگەڵ باسی خۆیدا باسی دەوروبەری خۆی دەکا، باسی ژیان دەکا. ئەمەیە داو و دەستووری داستانبێژی. هەرکەسە ژیانێکی خۆی بەرانبەر بە ژیان، شایەتییەکی خۆی هەیە. قسەیەکی سەرەتاییانە هەیە، دەڵێ: «ژیانی هەرکەسێ بگرێ ڕۆمانێکە بۆ خۆی.» نەخێر وا نییە. هەموو کەسێ ڕۆمان نییە. ڕۆمان ژیانێکە. ڕۆمان ئاووهەوایەکە. ڕۆمان ڕۆنانی دنیایەکی نرت و نوێیە. لەگەڵ ئەم دنیای خەونەدا ڕۆنانی دنیایەکی ڕاستەقانێتییە، ئەفراندن و گووراندنە ڕۆمان.

* ڕاستەقانێتیی ڕۆمانێ

– ڕاستەقانێتییەکی نرت و نوێ. دنیایەکی تەڕ و تازە. سەرەڕای ئەوەیش، دنیایەکی وایش نەبێ کە کوتومت و بەڕاستی لە دنیایەکەمان بچێ. دروستکردنی دنیایەکی تایبەت بە خۆی، پڕ بە باڵای خۆی، ڕۆمان. لەم دنیا تازەکوورەیەدا، ڕاستەقانیەتیی ئینسان یەکلا دەبێتەوە، یەکچاو دەبێتەوە. ساغ دەبێتەوە. لە داستانە گەورەکاندا ئەمە، هەموو، بەو جۆرە بووە. هۆمیرۆس بەو جۆرەی کردووە، ستاندال وای کردووە، تۆلستۆی وای کردووە، سێرڤانتس بەو ڕەنگەی کردووە. سێرڤانتس (دۆن کیشۆت) نییە. سێرڤانتس ئینسانێکە ژیان و ئاووهەوای (دۆن کیشۆت)ی لەو چەرخانەدا لە چاو خۆیەوە ژیاوە. ئینسانێکە دواهاتنی سەروبەندی شۆڕسواریەتی ژیاوە. ئینسانێکە شیرازە تێکچوونە گەورەکە ژیاوە. ئینسانێکە شۆڕەسواریەتی بوون بە بابەتێکی گاڵتەوگەپ ژیاوە، بیانی کەوتن و نامۆییکردن ژیاوە. لەبەر ئەوە، نەسێرڤانتس پێویستی بەوەیە ببێ بەو دۆن کیشۆتەی خۆی گووراندوویە،

نەستاندالیش پێویستی بەوەیە ببێ بەو دوشێ سانسێڤرینایەی، خۆی گووراندوویە. کارەکە کاری خۆڵقاندنە، کاری گووراندنە. واتە گووراندنی ئەوەی دەیژێێ، گووراندنی ئەوەی بۆی بە تاسەوەی، گووراندنی ئەوەی هەستی پێ دەکەی، گووراندنی ئەوەی کاری لە خوێن و ڕەگ و ڕیشەت کردووە. ئەمانە سەرلەبەر لەو گووراندن و ئیجاتکارییەدایە. واتە داستان چ پێویستی بەوە نییە، ئیلکەم و بیلکەم هەر دەبێ یەکێکی هەبێ. چونکە ئەو بۆ خۆی ئیجاتکارە. ئەو بۆ خۆی دەوروبەر و دنیاکە دەگووڕێنێ، ئەوە پەی بەڕاستیی ئینسان دەبا. ئەوە پەی بەڕاستیی سروشت دەبا. لەبەر ئەوە فلوبەرت کە گوتوویە: (مادام بۆڤاری خۆمم) قسەکەیم زۆر بەلاوە سەیر و سەمەرەیە. من ئەمەم، وەک هەڵە بێ، بەلاوە وایە، هونەرمەندان، برێ شتی سەر بە ژیانی خۆیان تێکەڵ بە نووسینەکانیان دەکەن، بەڵام ژیانی خۆیان، سەربهوردی خۆیان نانووسن. شتهایەک لە نوێژەنەوە دەگووڕێنن. دنیایەک دەگووڕێنن. جا لەم ڕوانگەیەوە ستاندال زۆر بە گرینگ دەزانم. من خووێکم هەیە: پێش ئەوەی دەست بە ڕۆمان نووسینێ بکەم، ستاندال جارێ دەخوێنمەوە و تەواوی دەکەم (دێری پارما) و (سوور و ڕەش) ئینجا نازم حیکمەتیش دەخوێنمەوە. پێش ئەوەی دەست بە نووسینی ڕۆمانێ بکەم، دەمەوێ بەرکاری ئەم هەردوو ڕۆمانە بکەوم. نازم تورکییەکی بەسام لەکار دێنێ. ئەمە کاتێ لەگەڵ چەمکی ڕۆماننووسیی ستاندالدا یەک دەگرنەوە. میعمارییەتێکی بەسام و ڕوختەی ڕۆمانێ دەبەخشێ. ئینسانی هەرە نزیک لە بیر و بڕوای منەوە ستاندالە. ئەو خەسیەتانەی ئەو وەسفیان دەکا، نموونەکانی، ئەوانەن کە لە کەسایەتیی ڕۆماننووسیی منەوە نزیکترن. سەرلەبەری کەسانی ڕۆمانەکانی ستاندال کە لە چینی هەرە خوارێی کۆمەڵەوە دێن زۆر بەهەڵوەداوە بەرەژوور هەڵدەکشێن.

لە قارەمانی (سوور و ڕەش)، لە جۆلیان سۆرێلەوە بگرە تا قارەمانی (دێری پارما) فابریس دێ دۆتگۆوە، ئەمانە هەموو کەسانی تا بڵێی بەئیحتیراس و گیرۆدەن، تا بڵێی بەشوور و شەوقن. ستاندالیش، ڕەنگە خۆی، هەر پیاوێکی

دەرەوە بووبێ یانی: کەسانێکی لە چینی هەرە پاینی کۆمەڵەوە هاتووی ئاشقە بەرەو سەروو هەڵکشان، گیرۆدەی بەرژوور هەڵکشان بوون.. لەم چەرخەیشماندا ئەم جۆرە ئینسانانە دەبینین. کەسانی ستاندال، لە سەرێکەوە دەتوانین بە ڕێبەر و نموونەی ئاشقە سەرمایەداری و بە سەرمایەدارییەوە گیرەوەبوونێکی بە سام لە قەڵەم بدەین. دیارە، گیرۆدەییەکی تریش هەیە، ئاشقە لایەنێکی تریش هەیە: گیرۆدەیی خەبات لە پێناوی دنیاگۆڕیندا، ئەم ئاشقە خەباتی دنیا گۆڕینەیش لەمبەری ئاشقە سەرمایەدارییەوە وەستاوە.

* یانی، تەنیا خواست و ئارەزووی چینێک نییە.

– نەخێر.

* خواست و شوور و شەوقی دنیا گۆڕین.

– شوور و شەوقی گۆڕینی دنیایش بۆ خۆی گیرۆدەیی و ئاشقێنییەکی بەسامە.

شوور و ئارەزووی خۆگۆڕینیش و دنیاگۆڕینیش لە کەسانی ستاندالدا زۆر چاکی کار تێدا کراوە. بەڕاستی، ستاندال ئەو پیاوە بەشوور و شەوقە بێ پایانانەی زۆر چاک لەکار هێناون.

* ستاندال یەکێکە لەو نووسەرانەی لە مێژووی کۆمەڵی فەرەنسزاندا قۆناغێکیان بڕیوە، وەنییە؟

– بەڵێ وایە. قۆناغێکی هەرە گەورەیش.

* باشە، ستاندال، ئەو کەلەپوورە کەڵەکەبووەی پێش خۆی، ئەو کەلەپوورە کەڵەکە بووە گەورەیەی چۆن لە خۆیدا هەزم دەکا و دەیکا بە هی خۆی؟ بەلای تۆوە، لە مەسەلەی دنیاگۆڕیندا، ئەم کەلەپوورە کەڵەکەبووەی چۆن بەکار هێناوە؟ ئەم چالاکییەی لەم ڕووەوە دەبێتە چی؟

– من پێم وایە، ستاندال لەم دنیا بەم جۆرە گۆڕینەدا بەدەردێکەوە نەگلاوە، هیچ گرفتێکی نییە. سەرەڕای ئەمەیش ئاشقە ناپلیۆنە. بەڵام بڕوانە، ناپلیۆن، خۆی پیاوێکە لە ناوجەرگەی خولیای دنیاگۆڕیندایە. خۆی بۆ خۆی هەڵوەدای ئەو شەوق و شوورەیە. جا ستاندالیش لەو شەوق و شوورەی بەرانبەر بە ناپلیۆن سەرسوڕمانەدایە. خۆی لە ئەسڵدا، هەرچی نموونە کەسەکانی ڕۆمانەکانی ستاندالیش هەن سەرلەبەر، هەر بەو شەوق و شووری لە ناپلیۆن سەرسوڕمانەدان. ستاندال چونکە خۆی ئاشقە ناپلیۆنە نموونە قارەمانەکانی ڕۆمانەکانیشی هەر بەو ئەشق و خولیایەوە گووراندوون. جۆلیان سۆڕێلیش فابریس دێل دۆنگۆی بەو جۆرە خوڵقاندوون.

* چونکە ستاندال بۆ خۆی عەودالی ناپلیۆنە.

– بەڵام چۆن عەودالبوونێ! گەرچی ستاندال، بیر و بڕوای خۆی و لە دنیا نۆڕینی خۆی تێکەڵ بە ڕۆمانەکانی دەکا، بەڵام وێڕای ئەوەیش، ستاندال هەرگیز جولیان سۆڕێل نییە، فابریس دێل دۆنگۆ نییە و نەشبووە بەوان، هیچ پێویست بەوە ناکا. ئەو کەسانە هێندە بە سەرسوورهێنی، هێندە بەسەرکەوتنێکی گەورەیان دەگوورێنێ، تەنانەت لە ئەمان خۆشیان و لەوان خۆشیان بەڕاستەقانیتر لێ دەکا و بەڕاستەقانیتریان دەگوورێنێ.

* دەتەوێ بڵێی، ئەگەر ستاندال خۆی لە خۆی دووابا کەسانی ئاوهای بەو ڕاستەقانێتییە وا نەدەگووراند؟

– کەسێکی ڕۆماننووسێ، هونەرمەندێ، داستاننووسێ دەیگوورێنی، خۆی لە خۆی ڕاستەقانیترە. ئەمەیە قنیاتی من. من لەو بڕوایەدام هونەرمەندان، تێکرا، کەسانێکی لێیان دەدوێن، لە خۆیان بەڕاستەقانیتر دەگوورێن. کەسانێکی تۆلستۆی گووراندوونی، کەسانێکی ستاندال گووراندوونی بە نموونە بێنییەوە، لە مرۆگەلێکی ڕاستەقانی ڕاستەقانیترن. جارێ خۆ کەسانێ کە گۆگۆل دەیانگوورێنێ بە نموونە بێنینەوە، ئەوە هەر

ڕاستەقانییەکانی ڕاستەقانین. جا گرینگیی ڕۆمانیش لەمەڕا هاتووە. بەنموونەی ئەو سریشتەی فۆلکنەر گووراندوویە لەو سریشتەی ئێمە دەیبینین و دەیزانین و بۆی دەچین سریشتێکی ڕاستەقانیترە. جا بێتو لێرەڕا بۆ مەسەلەکە هەڵکشێین وابزانم دەگەینە شوێنێ.

* دەتوانی باسەکە بە ڕۆماننووسانی خۆمانەوە گرێ دەی؟

– ڕۆمانەکانمان بە داو و دەستووری داستانبێژیی خۆمانەوە ببەستین، بتوانین ببەستین. دەتوانین لە ڕۆماننووسیدا هەنگاوێکی گەورە بەرەوپێش هەڵێنین.

* بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی خۆمان؟ پێشنیهادی ئەوە دەکەی لە پێشان لە سەرچاوەکانی خۆمانڕا تێ هەڵچین، نەک لە ڕۆمانی دنیاوە؟

– ڕۆمانی دنیا دەسکەلایەکی گرینگە بەدەستمانەوە. زۆر شت هەن لە ڕۆمانی دنیاوەیان فێر بین. لە تورکیا بوون بەڕۆماننووس، بەبێ زانینی ڕۆمانی رووس، کارێکی سانا نییە. بەڵام ئەی داستانی کوێرئۆغڵووی خۆمان چییە؟ ئەو چۆن گوتراوە؟ داستانەکەی کوێرئۆغڵوو لە ڕاستینی گەورەی ئەو نەگەین کارێکە لە کردن نایە و سەر ناگرێ. بوون بە ڕۆماننووس. بڕێ هەلومەجی خۆی هەن.

* دەکرێ نەختێ داو و دەستووری داستانبێژیی کوێرئۆغڵوومان بۆ بگێرییەوە؟ چونکە هەمیشە قسە لەو شوێنە هەرە گرینگە دەکەی کە داستانی کوێرئۆغڵوو لە ڕۆماننووسیی تۆدا گرتوویە.

– کوێرئۆغڵوو دەڵێی...

* یانی هەر کوێرئۆغڵوو نا، تەبیعی. مەبەستم کەلەپووری گەورەی خەڵکی وڵاتەکەمانە، ئەوەی خەڵک وەسەریەکی ناوە.

– ئەوەی خەڵک وەسەریەکی ناوە؟ جا بڕوانە، من فۆلکلۆر بە شتی دەزانم

دەژی. من فۆلكلۆر بە كۆمەڵێ هۆی مردوو نابینم. فۆلكلۆرەوانی ڕاستەقانی ئەمە زۆر چاك دەزانێ. لە هەموو سەردەمێكدا هونەرمەندی چاكیان لە ناو خەڵكدا هەڵدەكەوێ. گەل لەسەر داهێنانی شتی خێونەناسی بەردەوامە و هەر بەردەوامیش دەبێ. بڕوام بەمەیش هەیە. فۆلكلۆرەوانەكان خۆیان شایەتی ئەمەن. گەلان لە هەموو چەرخێكدا، لە هەموو شوێنێ. هەرگیز لە داهێنان ناكەون، بەڵام بەمەرجێ لە ڕەسەنایەتیی خۆیان دانەشۆرێن. بەنموونە لە ئیسویچ ڕادیۆ و سینەما و تەلەڤزیۆن جێگەی داهێنانی خەڵكەكە ناگرێتەوە، بەشی خەڵكەكەی نەگرتووەتەوە. سەرەڕای ئەم هەموو هۆ تازانە خەڵكەكە لە گۆرانی و لاوژە داهێنانی خۆیان، لە چیرۆك و داستان داهێنانی خۆیان، لە مەتەڵۆك داهێنانی خۆیان ناكەون و هەمیشە هەر بەردەوامن. ئەمە لە مۆدێرنترین وڵاتی وەك ئینگلستان و فەرەنگستانیشدا هەر وایە. كەچی وێڕای ئەمەیش، بەڵام زۆر خەڵكەكە ئەم جۆرە بابەتانە هەر ڕەنێو دێن و لە داهێنانیان دوا ناكەون. هەرچەندە ئێمە لەم سەردەمی ژیانەماندا نموونەی ئەمانە زۆر كەم دەبینین. ئەمە لێشاوێكە هەر وا هاتووە و هەر وایش دەڕوا. ئەوانەی خەڵك بۆ خۆیان دەیگوورێنن ئینسانانی پاش سەد ساڵی تر بە چاوی خۆیان بیانبینن و بەگرتنی دەست بیانگرن. دەمەوێ ئەوەیش بخەمە سەر قسەكەم: ئینسانانی وڵاتی ئێمە هێشتا فێرە خوێندن و نووسینێكی وا نەبوون. تەلەڤزیۆن تازە لە وڵاتی مە پەیدا بووە. ڕادیۆ تازە وا خەریكە دەكەوێتە هەموو ماڵێكی. لە سەردەمێكدان، هێشتا زۆرمان فەرقە لەگەڵ هەندەران. سەرەتا فۆلكلۆرانەكان، داهێنان و ئیجاتكاری ناو خەڵك، پێداویستێكی زەروورن. چونكە داهێنان هەر بۆ خۆی پێداویستێكی زەروورە. هونەر ماكێكە لە خوێنی مرۆدا دەگەڕێ، شتێ نییە لە مرۆ بەدەر بێ، هونەر لە مرۆ جوێ ناكرێتەوە. ئینسان بێ هونەر نابێ. هەر لەبەر هەندێیشە خەڵكی هەموو شوێنێ، بێ چەندوچۆن لە داهێنان و گووراندنی خۆ ناكەون و بەبێ داهێنان و گووراندن دەرنابەن و هەڵناكەن، هەمیشە هەر دادەهێنن و دەگوورێنن و درێژە بەو كارە دەدەن. تا خەڵك هەبن بەرهەمی هونەری داهێنان

و گووراندنیش هەر دەبێ. ئەم مەیدانەیش لە کن ئێمە تا بڵێی دەوڵەمەند و بەبرشت و ئێرووە. مەلای مەزبوورەیش هەیە، قەرەجە ئوغلانیش هەیە، پیرسوڵتان عەوداڵیش هەیە، کوێرئۆغڵوویش هەیە، هۆمیرۆسیش هەیە، داستانی ماناسیش هەیە، هەیەی کوڕی هەیەیش هەیە. بۆ درێژەدان بەم پێداویستییە گەورەیە، ئەمرۆکە، لە ئەنەدۆڵێ، سەدان شاعیر هەن، داستان دەگێڕنەوە، سەرتاسەری ئەنەدۆڵێ بگەڕێ تووشی زۆر پاژی هۆمیرۆس دێی. ئەمانە لە کوێڕا هاتوون؟ لە چیرۆکەکانماندا زۆر تووشی چیرۆکی هیندییان دێی. دەتوانی ئەمرۆ لە ئەنەدۆڵی چیرۆکی عەرەبان، ئی هەزار و یەکشەوە بەئاشکرا ببینییەوە. تەنانەت تووشی زۆر پاری داستانی گەلگامێش دێی لە ئەنەدۆڵێ. ئەم داستان و چیرۆکانە بە زمانێکی پاراو و تەڕوبڕ و پێشکەوتە و زۆر جوان لە ئەنەدۆڵێ دەگێڕدرێنەوە. خۆ لە باری زمان پاراوییەوەیان بگری ئەوە هەر مەپرسە. گەلان لە یەکبینە خەریکی زمان داهێنانن. هەر شتێکی داشی دەهێنێ، بەپێی پێداویستیی سەروبەندی خۆی دای دەهێنێ. هەر لەم سەروبەندەی ئێستاکێماندا وشی وا لە ئەنەدۆڵێ داهێندراون هەرگیز بەرگوێ نەکەوتوون و ئەم وش داهێنانەیش هەر بەردەوامە. زۆر وشە لەسەر مەکینە داهێندران لە ئەنەدۆڵ. کەچی زۆر نییە مەکینە کەوتووەتە وڵاتی تورکیاوە. زۆر وشە لەسەر ڕادیۆ داهێندراون بیانبیستی سەیرت لێیان دێ. وشە لەسەر تراکتۆر، لەسەر پارچەکانی داهێندراون. وشەی زۆر تازە و نوێباون، تا ئێستا نەبیستراون. تراکتۆر چلۆن کار دەکا؟ چۆن چۆنی دەڕوا؟ ئەمانە سەرلەبەر، وشی سەیر سەیریان بۆ داهێندراون.

تراکتۆر چیرۆک و مەتەڵ و سترانی لەسەر گوتراون. ئێستا دەتوانم چەند سترانێک، لەوانی لەسەر تراکتۆر هەڵبەستراون بۆ لێ دەم. «مەکینە مەکینە، هۆ مەکینەی خوێنرێژ..» گۆرانییەکە دەتوانم بۆتی بڵێم. واتە خەڵک هەمیشە خەریکی داهێنانە. ئەگەر سەری زمان و بنی زمانم هەمیشە هەر باسی کوێرئۆغڵوو و چیرۆکەکانی کوێرئۆغڵوو بێ، ئەوە لەبەر هەندێکەیە کە ئەمانە بوون بە کولتووری شێوە و تەرزی دەربڕینم. ئەوەی بەسەر زاری خەڵکەوەیە

یەکێکە لە کولتووری بنەڕەتی من. ئەمن دەمەوێ بە زمانی خەڵکەکەم بدوێم. تەڕ و پاراویی زمان لەوەدایە. ئەو زمانە هەموو ڕۆژێ شتێکی نوێ دەگووڕێنێ. چونکە ژیی مرۆ خۆی بۆ خۆی گووراندن و خوڵقاندنە، بەڵام بەمەرجێ مرۆ ڕەسەنایەتیی خۆی نەدۆڕاندبێ. خەڵک لە ئاخاوتندا، لە گێڕانەوەی ڕووداوێکدا هەمیشە شتی تازە دادەهێنێ. پێنج کەس ڕووداوێ دەگێڕنەوە، هەریەکەیان بەجۆرێکت بۆ دەگێڕێتەوە. ڕووداوەکە بەپێنج شێوەی جیاجیا، بەپێنج جۆرە تێڕوانین، بە پێنج جۆرە ژیان دەگێڕنەوە. چونکە دەربڕین بۆ خۆی جۆرێکە لە داهێنان و گووراندن. ئەو هیمەی ئەمن ئەرزی داهێنانی خۆمم لەسەر ڕۆناوە ئەمەیە. منیش لە نیگای شتان دادەهێنم. بەڵام کولتوورێکی وا دادەهێنم کە هی مەڵبەندی کولتووری ئەنەدۆکە، دەریای کولتووری ئەنەدۆڵە، لە کولتوورێنم تایبەتە بە خۆم. دەتوانم بڵێم من خۆم لەگەڵ ئەنەدۆڵدا پێک هێناوە. کە زمانی خۆم پێک هێنا، خۆمم لەگەڵ ئەنەدۆڵدا پێک هێنا.

* باسەکە بادەینەوە سەر کوێرئۆغڵوو..

– ئا، جا بابزانین کوێرئوغڵوو بە چ شێوەیێ دەدوێ؟ ئەمن لەوەم نۆڕیوە. بەڕاستی ئەمە ساناییپەکی بۆ ساخ کردمەوە. دیارە من کە لە بابەتەکانی خۆم دەدوێم، هەڵبەتە لە بابەتەکانی کوێرئۆغڵوو نادوێم. ئەوەی لە کوێرئۆغڵوودا باس کراوە. من باسی ناکەم. تەنانەت لە باسکردنی ئەسپەکەیشیدا ئەمن وەکو وی باس ناکەم.

* ئای کە چەند لەسەر ئەسپەکە دەڕۆی..

– لە کوێرئۆغڵوویشدا ئەو سەرەتایەی پتری درێژە لەسەر پێ درابێ ئەسپەکەیە. داستانی کوێرئۆغڵوو لەسەریرا تا دواییپەکەی پڕە لە سەرەتای ئەسپ. ئەمن کە لە ئەسپەکە دواوم هەرگیز وەک کوێرئۆغڵووی لێ نەدواوم، لاساییی ئەوم نەکردووەتەوە. بەڵام جێگەی داستانی کوێرئۆغڵوو لە

دروستبوونمدا گەورەیە. هەڵبەتە بەپلەیەک گەیشتووم نووسەرێ، هونەرمەندێ، دەگاتە پلەی گەشەکردن و فراژیبوون، دەگاتە پلەی شێوە دەربڕینێ. بەڵام من کە باسی ئەسپم کردووە، بێگومان کوێرئۆغڵوو لەم جۆرە باسکردنەیدا، لە گەیشتنم بەو جۆرە دەربڕینەمدا دەوری یەکەمی گێڕاوە، من ئەمە زۆر چاک دەزانم.

* وا بزانم لە ئەسپ باسکردندا هەر لەو ڕێگەیەوە بەڕێ کەوتووی کە کوێرئۆغڵوو لێوە بەڕێ کەوتووە. واتا زانیوتە کوێرئۆغڵوو بە چ شێوەیێک لە ئەسپ دواوە.

– هیچ جۆرە بەندیوارییەکم بە شێوە ئەسپ وەسپکردنی کوێرئۆغڵووەوە نییە. قسە لەوەیە، مرۆ چۆن خۆی پێ دەگەیەنێ، نووسەر چۆن دەکەوێتە سەر باری تایبەتی خۆی، قسە لەوەیە، تۆ لە هونەری ئەسپ وەسپکردنی کوێرئۆغڵوویش پسپۆڕ بی و بۆ خۆشت کە دەکەوییە سەر ئەسپ وەسپکردن وای وەسپ بکەی، هەر لە خۆت بووەشێتەوە و لە شێوە وەسپکردنی خۆت بچێ، نەک لە ئی یەکی تر. هەر کەسە خۆی لەگەڵ جۆرە کەلەپوورێکدا گەشە پێ دەدا.

دیارە کوێرئۆغڵوو لە شێوەی ئەسپ وەسپکردنی مندا یەکەم جێگەی گرتووە. بەڵام من لە شێوە ئەسپ وەسپکردنی تۆلستۆیش کەڵک وەردەگرم کە لە (ئاننا کارینینا)کەیدا خوێندوومەوە. واتا شێوە ئەسپ وەسپکردنی تۆلستۆیش دەزانم و شێوە ئەسپ وەسپکردنی ستاندالیش دەزانم، کە لە (دێری پارما)دا خوێندوومەوە. لێ کێهەیان بنەڕەت و هیمی منە؟ کوێرئۆغڵوو. ئەمەیش وەنەبێ ڕێگەی لە ئەزموونی تری سوود وەرگرتنی لێ گرتبم، لە ئەزموونی هەموو دنیایش سوود وەردەگرم. بارگیرەکەی فابریس دێل دۆنگۆ لە شەڕ و گەڕدا، ئەسپەکانی شەڕ و تێک گیرانەکەی بۆرۆدینۆ، بارگیرەکانی ئەو شەرە، ئەسپەکانی (ئاننا کارینینا)، هەروەها تەرز و شێوە باسکردنیان، جا بەڕاستی تۆلستۆی زۆر جوانی وەسپ کردوون، شێوەی ئەسپ وەسپکردنی

تورکمانەکانی چقورئۆوا، ئەمانە سەرلەبەر دەستیان لە ساخکردنەوەی شێوەی تایبەتی ئەسپ وەسپکردنی مندا هەیە. من ئەمانەم هەموو، لە خۆمدا هەڵشێلاون و شێوەی لە ئەسپ ڕوانینی خۆم لەسەر هەڵناوە. ئینجا ئەوساکە، وا بزانم شێوە دەربڕینێکی دەوڵەمەند و تێروپڕ و بەهێز و پێز دێتە گۆڕێ. ئەم گەشەکردن و فراژیبوونە لە بابەتی تریشدا دەبیندرێ: لە خۆڕسکدا، لە ئاودا، لە دار و درەختدا، لە باڵندە و پەلەوەردا، لە گیاوگۆڵدا لە گوڵ و گوڵاڵە و گوڵێک و گوڵووکاندا، لە ئینساناندا، لە هەموو شتی زیندوو و وەک زیندوودا دەبیندرێ. بەڵێ باسی ئینسانیش هەیە. زۆر گرینگە ئینسان، کوێرئۆغڵوو باسی دەکا، چیرۆکەکانمان وەسپی دەکەن، خەڵکی وڵاتەکەمان، بەجۆراوجۆری وەسپ دەکەن. بەڵام تۆلستۆیش وەسپی دەکا، ستاندالیش وەسپی دەکا، ئەلبێر کامۆیش وەسپی دەکا. هونەرمەندێکی بە ڕەنگ و ڕیشە ئەنەدۆڵی بێتو شێوەی لە ئینسان گەیشتنی ئەم چەرخە لەگەڵ کەلەپوورە بەسەریەکدا کەڵەکەبووەکەی خۆیدا تێکەڵ بکا، شێوەی لە ئینسان گەیشتنێکی هەڵاوێردەی جیاوازی لێ دێتە گۆڕێ. ڕەگ و ڕیشەکەی خۆی لە سەرێکەوە و کەلەپووری دنیایش لە سەرێکەوە. ئینسانێ دێتە گۆڕێ لە سەرتۆپی ئەمانە خەملیبێ. ئینسانێکی تایبەت بە خۆی، نموونە هونەرمەندێکی لێ دێتە گۆڕێ.

* ئاخر ئەستەمبووڵیش هەیە. ئەویش بۆ خۆی شتێکی جیاوازە. لە پاڵ هونەرمەندە بە ڕەگ و ڕیشە ئەنەدۆڵییەکاندا، هونەرمەندی بە ڕەگ و ڕیشە ئەستەمبووڵیشمان هەن.

– نەخێر. ئەمڕۆ، شاکار لە ئەستەمبووڵ ناگورێ. ئەستەمبووڵییەکان زمانیان نییە. کۆڵ و کۆڵەوارن. تورکییان نییە. کە زمان نەبوو کەلەپووریش نییە. کەلەپووری ئێمە لە نێوجەرگەی خەڵکەوە سەری هەڵداوە و لەگەڵ چەندین جۆرە شارستانییەتیی سەدان ساڵدا هەڵشێلدراوە و هەڵاتووە، کەلەپوورێکی زۆر دەوڵەمەندە. زمانەکەشمان هەر بەو جۆرەیە. زاری

ئەورۆکەی ئەستەمبوولی هێندەی بەبەرەوە نییە رۆمانی پێ بنووسرێ، شیعری پێ بنووسرێ. بەشی ئەوە ناکا چیی پێ بنووسرێ. تورکیی ئەستەمبوول سەری بگری و بنی بگری لە فەرهەنگۆکێکی سێ سەد! پێنج سەد وشەیی بەولاوە ناروا.

تورکیی عوسمانیش هەر بەو ئاوایەیە. زمانێکە لە ژیان بەدەر بووە و رەق و هیشک هەڵاتووە، کوتومت وەک تورکییەکەی ئەستەمبوول. نووسین بە زمانی ئەستەمبوول لەبار بوایە، نازم حیکمەت لە هەموو کەسێکی چاتر پێ دەنووسی. نازم حیکمەت چەندین ساڵ لە زیندان نەخرابا، بەو کەلەپوورە ئەنەدۆڵییە دەوڵەمەندە، بە تورکیی ئەنەدۆڵ پێ نەگەیشتبا، نەدەبوو بە نازم حیکمەت، خۆی بەو تورکییە ئەنەدۆڵییە دەوڵەمەندە بێ پایانەی لە یۆنس عەمرە و تەمەرەجە ئۆغلان و پیرسوڵتان عەبداڵ و داداڵ ئۆغلووەوە، پشتاوپشت، هاتووەتە خوار و گەیشتووەتەوە پسەل گۆشی نەکردبا نەیدەتوانی شیعرەکانی، شیعرە شاکارەکانی رەنێو بێنێ.

* لە پاشان دەگەڕێینەوە سەر نازم حیکمەت. بەجیا لێی دەدوێین.

– نا، پێم وایە تا ماوەیەکی دوور و درێژ رۆمان لە شارانەوە سەرهەڵنادا. سەریش هەڵبدا هەر لە ئەنەدۆڵەوە سەرهەڵدەدا. لەگەڵ عابیدین دینۆدا دەمانکردە گەمە، دەمانگوت بریا هەموو نووسەرێکی ئەستەمبوولییان ساڵێ بەتۆبزی لە گوندی چەرداخ، لە ناوچەی چقورئۆوا دەهێشتەوە، نەختێ بۆ خۆی فێرە تورکی بوایە.

* ئەتۆ بێ پشوو، هەر لەسەر چقورئۆوات نووسیوە.

– نووسیومە. مرۆ لەنێو کۆمەڵە هەلومەرجێکدا لەدایک دەبێ و گەورە دەبێ و دەمرێ. ئینسان هەلومەرج دەیکا بە بوو. ئەمن مارکسیستێکم، هەوڵ دەدەم هەمیشە بە بیر و بڕوای مارکسییانە بیر بکەمەوە. فەلسەفەی مارکسیسزمیش ئەمە هەر بەو جۆرە دەڵێ: ئینسان لە ئاسمان نەهاتووەتە

خوار، ئینسان لە هەلومەرج و دەوروبەری خۆی ڕووت ناکرێتەوە.

جارێکیان لێیان پرسیم: «ئەوە بۆچی هەمیشە هەر بە چقورئۆواوە گرتووتە و لە یەکبینە هەر باسی چقورئۆوا دەکەی؟» لە ئەمەریکا لە کۆنفرانسێکدا لێیان پرسیم. من لە چقورئۆوا لەدایک بووم و گەورە بووم. لە چقورئۆوا ژیاوم. سەرانسەری ژیانم لەو ناوە بەسەرچوو ئێستایش لەم دەمەدا، وا لە ئەستەمبووڵم، لە ئەستەمبووڵ دەنووسم. لەوێ گوتم: «خۆ هەر من لە چقورئۆوا نانووسم. تۆڵستۆیش چقورئۆوای نووسی. سێرڤانتسیش چقورئۆوای نووسی، ستاندالیش چقورئۆوای نووسی. هەرچی نووسەری ڕەسەنی ئەم دنیایە هەیە، هەرچی هونەرمەندی ڕەسەنی ئەم دنیایە هەیە، سەرلەبەریان چقورئۆواین. چونکە هیچ مرۆیەکی لە هەلومەرج و دەوروبەری خۆ دامالکاو نابێ بە هونەرمەند. هونەرمەندی ڕووت نییە و نەبووە. ئینسانێکی ڕووت و پەتی لە بیرکردنەوە نایە. هونەرمەندیش، وەک هەر ئینسانێکی تۆ بیگری، لەگەڵ هەلومەرج و دەوروبەری خۆیدا پەیدا بووە و هەڵکەوتووە.

* دەتەوێ بڵێی ئەو هونەرمەندە گەورانە، هەریەکە چقورئۆوای خۆی گێڕاوەتەوە. هەریەکە لە نیگای لەیلێی خۆیەوە ڕوانیویەتە دنیا.

– تاکە هونەرمەندێکی گەورە چییە نادۆزییەوە، خۆولاتی نەبێ. لەو وتارەمدا پترم پێ لێ هەڵبڕی، گوتم: «هونەرمەندی هەرە خۆولاتی کافکایە.» کە نووسینەکانی کافکا دەخوێنییەوە، هەست دەکەی دیوارێکی تاریکی ئەستووری لە پێشە خۆی داناوە، دنیا بەلای ئەوەوە دیوارێکی تاریکە. گۆڕانی و لاوژەی ئەو خەمە. گۆڕانیی خەم دەچڕێ. مرۆ چۆن دەتوانێ گۆڕانیی وا خەماوی و ناهومێدانە بچڕێ؟ دەبێ لە پێشان بزانی چۆن ژیاوە، دەبێ لە ژیانی ورد بێتەوە، ژیانی کافکا زۆر سەیرە، نەک هەر کافکا، ژیانی هەموو هونەرمەندێکی ڕەسەن وا سەیرە. ئەم سەیرایەتییەشیان لەوەدایە کە لە خۆیان نادوێن، لەوەدایە کە لە تیرەی ئینسان، لە سرشت دەدوێن. فلۆبەرت

دەڵێ: «من مەدام بۆڤاری»م، ناڵێ: «من دارم، بەردم.» چونکە شتی وا نابێ و نەبووە. ئینسان خۆی دنیایە. ئینسان کەڵەکەبووی تێگەیشتنە گەورەکانە. لەبەر ئەوە، کە لە دنیا دەدوێ، وای لێ نادوێ شتێکی تر بێ، وای لێ نادوێ دار و بەرد بێ. دەتوانێ وەک فلۆبەرت بێ ئەوەی «مەدام بۆڤاری» بێ، لە دنیا بدوێ. سەرلەبەری هونەرمەندە گەورەکانیش، لەوەتی هاتوونە گۆڕێ، تا ئەمڕۆکە، لە هەر چییەک دوابن، وای لێ دواون، هەر خۆیان دەتوانن بەو جۆرەی لێ بدوێن. لە دنیا دواون، لە خۆیان بەدەر دواون، لە دار دواون، لە ئاو دواون. هیچ پێویست بە لەخۆدوان ناکا.

جا چ دەبێ؟ وا لە خۆیشیان دوان. من لە دژ ئەمەیش نیم. بە من چی؟ بەڵام تەنیا هەر «من مەدام بۆڤاری»م، ئەمە شتێکی زۆر هەڵەیە. هەڵەی هونەری ئەمڕۆی ئێمەیش هەروەک ئەو هەڵەیەیە کە لە ڕێبازەکەی فلۆبەرتی فەرەنسزانەوە هاتووەتە گۆڕێ. چونکە زۆربەی هونەرمەندەکانی ئێمە، هەر دەڵێی هونەرمەندی بە بنەچەکە فەرەنسزن. زۆربەی هونەرمەندەکانمان، تا دەگاتە ئەمڕۆ، ڕووناکییان لە هونەرمەندانی فەرەنسزانەوە وەرگرتووە. بە تروسکەی وان بەرپێی خۆیان دیتووە. ئەمن ناڵێم ئەدەبیاتی فەرەنسزان نەخوێننەوە، فێری نەبن، نەخێر، ئەمن وا ناڵێم. لەوەتەی هەم، کتێبەکەی ستاندالم لە دەست ناکەوێتە خوار، دەسکەلای دەستم ئەو کتێبەیە، هەر جارێکی دەیخوێنمەوە، شتێکی تازەی لێوە فێر دەبم. بەڵام هەرگیز نەکەن لاساییان بکەنەوە. کوتومت لاسایی کرانەوە، هەرچی لاسایی نەکردبنەوە بەچاوی سووکیان نۆڕیونێ و بەکەمیان زانیون.

یەک لە شاعیرە لاوەکانمان گوتوویە: « بێز لەم فۆلکلۆر و مۆلکلۆرە دەکەمەوە؟» یانی چی؟ یەکجار بە چاوی سووکی دەنۆڕییە فۆلکلۆر. قەرەجە ئۆغلانی بەلاوە شتێکی کەم بوو، گاڵتەی بە یۆنس عەمرە دەکرد. شتی وا نابێ. نابێ، وا بێ پارەکە، یەک لە چیرۆکنووسەکانمان گۆتبووی: «ئەمن زۆر سەرسامی بێتهۆڤنم، قێزم لە گۆرانیی نێو خەڵک دەبێتەوە.» یانی چی؟ خۆ بێتهۆڤن خۆی قێزی لە فۆلکلۆر نەدەکردەوە، نەک هەر ئەوە، بگرە بەهەرەشی

لێ وەرگرتووە. بێتهۆڤن خۆی بنەڕەتەکەی فۆلکلۆرە. سەرلەبەری هونەرمەندە گەورەکانی دنیا تالاری هونەریان لەسەر فۆلکلۆر هەڵازنیوە. فۆلکلۆر هیمی هونەری هەموو هونەرمەندانی سەر دنیایە. بە ستران و لاوژەتەوە، بە داستانتەوە، بە چیرۆک و مەتەڵتەوە، بەدرێژاییی چەرخەکان هەر ئەو سەرچاوەیان بووە. واتا: ئەو سەرچاوە گەورەیەی خەڵک پێکەوەی ناوە. کۆمەڵگە ڕای ناوە. هونەرێ لەوی بچڕابێ هونەر نییە، بیژۆکە، نەوەکامە، کاڵە، کرچە... چ نییە. نموونەی نییە بیهێنمەوە. یەک تاکە زەلامی وا هەڵفەکەوتووە. کە دەروانییە بێتهۆڤن بنەوەی، بنەوەی ئەو بلیمەتییەی سەرلەبەر مۆسیقای نێو خەڵک و سەرزاری خەڵکە. بەرچە و ڕێچکە، بە بنەڕەت، هی ناو خەڵکەکەیە.

بێگومان، بۆ خۆیشی شتی تازەی خۆی داهێناوە، بەڵام کە لێی دەکۆڵییەوە یەکسەر کەلەپوورە بە سەریەکدا کەڵەکەبووەکەی گەلت تووش دێ. (باخ)یش هەر بەو ڕەنگەیە، شێکسپیر بگرە، هەرچییەکی هێناوەتە گۆڕێ سەرلەبەر، لەوان شتانن کە لە ڕێگەی گەلەوە، لە نیگا و ڕوانگەی گەلەوە، لە نیگای خەڵکەوە، لێیان تێ هەڵچووە و گووراندوونی. خۆ بێیتە سەر ڕاستییەکەی، (هاملێت) بەر لە شێکسپیر و پاش شێکسپیریش نووسراوە. بەردەوام هەر نووسراوە، بەڵام شێکسپیر لە هەمووانی جوانتر نووسیوە. (ماکبەس)یش هەر بەو ئاواییە. ئەمانە گشت، لە ئەفسانەی کۆن و چیرۆکی کۆن هەڵگوێزراون. لە (ڤاوست)ەوە بگرە تا نازانم کێ، ئەمانە زۆربەی زۆریان بەو جۆرەن. ئەمە وەنەبێ نموونە هێنانەوەیەکی دەق لە سەدا سەدیش بێ. ئینسان بابەتیش دەگوورێنێ. برێ ئینسان پەیدا بوون، برێ بابەتیان گووراندووە. زۆریش تازە و نرت و نوێن. قاعیدە و بنکە دانانێم، بەڵام ئەوەیش بزانە کە بەسەرکردنەوەی شاکارەکانی نێو خەڵک کارێکی سانایە. ئینسانانەتر خۆی ساخ دەکاتەوە، بە باری قازانجێکی گەورەتردا دەکەوێتەوە. ئەمەیش هەروا بەو سووک و سانایە بە نووسەرانمان ناسەلمێندرێ. ئەدەبیاتی ئێمە بووە بە ئەدەبیاتێ لە دەرەوەی کەوشەنی خۆی پەیدا بووە، بووە بە ئەدەبیاتێکی لەخۆ بەدەر. ئەدەبیاتی ئێمە

بە لاسایکردنەوە بووە بەو شتەی پێی دەڵێن ئەدەبیات. تا ئێستا ئێمە لەگەڵ کەلەپووری خۆمان، لەگەڵ کەلەپووری خەڵکەکەماندا نەبووین.

* چاکە، ئەدی نازم حیکمەت؟

– کەسێکی لە سەرینچاوەی ئەنەدۆڵەوە یەکەم شاکاری شیعری بۆ داهێنابین، یەکەم شاکاری هونەریی بۆ داهێنابین، نازم حیکمەتە. با نەختێ لە نازم حیکمەت باخێوین.

* دەق نۆرەی خۆیەتی.

– نازم حیکمەت لە خێزانێک کەوتووەتەوە باپیرە گەورەی ئەو خێزانە مەولەوی بووە. بنەماڵەکە بنەماڵەیەکی عوسمانی بووە. مەولەوی یانی چی؟ مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی شیعری بەفارسی گوتووە. هاتووە تەریقەتێکی دامەزراندووە. هەرکە گوترا مەولەوی، واتا: پیاوی تەریقەتە و کەسانی سەر بەو تەریقەتە. باپیری نازم حیکمەت یەک لەو پیاوانەیە. شیعری نووسیوە. نازم لە ناو دنیای ئەم فەلسەفە ئاینییە، ئەم فەلسەفەی سۆفییەتییەدا پێ دەگا. لەبەرئەوەی کە کوڕی پاشایەکی عوسمانی بووە. بتەوێ و نەتەوێ، وەک هەموو چینەکانی هەورازی عوسمانییان، لە لەلەکانی فێرە فەرەنسزی دەبێ. تا چ ڕادەیەک بە عوسمانیەتی پەل داوێ، هێندەیش بە فەرەنسیزیەتی فراژی دەبێ. نەختێ عەرەبی، نەختێکیش فارسی فێر دەبێ. ڕاستت گەرەکە، زمانی عوسمانیش هەر لەمانە پێک هاتووە، کەڵەکەبووی ئەمانەیە. کەلەپووری عوسمانی کەلەپوورێکی دەرباره و لەم دوو سەرینچاوە کەلەپوورە عەرەبی و فارسییە ئاو دەخواتەوە. لەم و لەو هاتووەتە گۆڕێ، هەڕەمەیە. لە پاشان نازم لە سەروبەندی شەڕی ڕزگاریدا دەچێ بۆ سۆڤیێت. بە سەردەمی هەرە بەگڕی شۆڕشی گەورە ڕادەگا. ئەو شتەی پێی دەڵێن سۆسیالیزم لەوێی دەخوێنێ. هەر لەوێ دەست بە شیعر نووسین دەکا. دەکەوێتە ژێر کاری شیعری شۆڕشگێڕانەی ئەو سەروبەندەوە. نۆبەرە شیعرەکانی نازم، ئەو شیعرانەی لە

سۆڤیێت نووسیونی زۆر مامناوەنجین. پەڕەنگەکانی بلیمەتیی ئەمرۆکەی نازم لەو شیعرانەدا نابینین. شیعری هەرە بەناوبانگی ئەو سەردەمەی دەریای خەزەر و شەنگەبییە. بەڵام ئەمانەیش پێت و پەڕەنگی بلیمەتیی نازم حیکمەتیان پێوە نییە. نازم لەو ڕۆژانەدا مردبا، پێت و پەڕەنگ و ئاورەنگی بلیمەتیمان ، شاعیرێتیمان تەنانەت لەو شیعرانەیدا هەرگیز نەدەبینی. نازم هەرکە دەگەڕێتەوە بۆ تورکیا و ناگەڕێتەوە دەچێتە نێو کۆڕ و دنیای دەستەیەک لە شاعیرانەوە، دەبێ بە خەڵکی دنیایەکی شاعیرانەی تر. دەبێ بە هاوڕێی پێنج برگەییەکان. لەگەڵ واندا شیعر دەنووسێ. ئەمانە شیعر بە برگەهۆن دەهۆننەوە، شیعری بە کێش و قافیە دەنووسن. نازم شیعری بێ قافیە دەنووسێ و هیچ شتێکی ئەوتۆیش نانووسێ لەوان سەرکەوتووتر و سوارچاکتر دیار بێ. بەنموونە: فارووق فایز (شۆڕشە تۆپەڵ نوورەکان لە زگە برسییەکانەوە هەڵدێن) دەنووسێ: نازمیش سەری بگری و بنی بگری هەر بەم پێودانە شیعر دەنووسێ. هەنگاوێ بەرەو پێشێ ناڕوا. لەمە بەولاوە ناڕوا. ئەوپەڕەکەی هەر ئەوەندەیە، ئەو نوختۆکەیێ لەوان چاترە.

* زۆر شۆڕشگێرە

– بۆ شۆڕشگێری، شۆڕشگێرە، بەڵام لەوێدا شاعیرێکی مامناوەندییە. نازم لە پێشتریێ شۆڕشی دیتبوو. لەوێدا شتێ پێک دێ. نازم کە لە سۆڤیەت دەبێ، لەگەڵ مایاکۆڤسکیدا دەبێ بە ئاشنا و ڕۆشنا. کەمۆکەیێ لە پووشکین دەگا، نەختێ لە هونەرەکەی هەڵدەگرێتەوە، ڕەنگە لەوێ پووشکینیشیان بەدەرز پێ خوێندبێ. ئەمن بۆ خۆم لەم بارەوە قسەم لەگەڵ کردووە. لێم پرسی: «پووشکینت دەناسی؟» «هەڵبەتە،» گوتی. فێری چەند شیعرێکی بووبوو. لەوەندەی گەیشتبوو، با کەمیش بێ، پووشکین چ کارێکی لە ئەدەبیاتی رووس کردووە. جا هەر لەو سەروبەندەدا دەگەڕێتەوە بۆ تورکیا، لە پاش ماوەیێ دەگیرێ و لە زیندان دەکرێ. چەند ساڵێکی بۆ لە زیندان دەنوێ. نازم چیی لێ پەیدا دەبێ؟ کەلەپووری فەرەنسزی، کەلەپووری فارس،

کـەلەپووری عـەرەب، کولتـووریکی تازەباویـش کە لە جـەنگەی شـۆڕشگێـڕیدا هەڵکەوتبـــوو، ئەمـــان هەمـــووی کـــەمـــە تـا کـــورتێ فـــێـــر دەبێ. بـەڵام نازم هێشتاوەکونێ ناتەواوییـەکی گەورەی هەبوو، کەلێنێکی گەورەی تێدا بوو. نازم هێشتا پیاوی گەلەکەی خۆی نەبوو.

* پیاوی ئەستەمووڵە.

– ئەسـتەمـووڵ ئەمە سـەد ساڵە، دوو سـەد سـاڵە، شـاعیرێ، هونەرمـەندێکی پێ نەبەخشـیوین. تۆفیق فیکرەت هەیـە. یەحیا فایق هەیە. نامـەوێ لە پیاوێکی وەک تۆفـیق فـیکرەت دابشـکێنم و بۆسـۆی کـەم، بەڵام بە هیچ کـامێک لەمـانە ناڵێین شـاعیری گەورە. ئەمانە شـاعیری مامناوەندیـن. نازم لەو سـەروبەندەدا، کـە لە زیندانیـان پـەسـتـاوت، تووشـی خـەڵک دێ، لـە پاش دوو سـاڵ زیندان شتێکی سـەیری لێ هەڵدەکەوێ. بە کۆڵێ کولتووری دەماودەمی خەڵک بەکۆڵێ گۆرانی و لاوژە و ستران، بە برێ ئەفسـانە و داستانەوە سەری دەرێناوە. نازم دەبێ بـە شـتـێکی تر. ئەو کـەرەسـتـە لەسـەر یەک کـەڵەکـەبووە لە پرێکدا دەتەقێتەوە، نازم لە خـەڵک مـوتوربە کرا، یـا خەڵک لە نازم مـوتوربە کرا. بەڵێ بەمە دەگوترێ موتوربە. هەرکە لە خەڵک مـوتوربە دەکرێ، یەکسـەر (داسـتـانی شـێخ بـەدرەدین) دێتـە گـۆڕێ. شـێرەکـانی مـە بەهەندەوەش نـاوەستن، نازم بە چەندین سـاڵ حـوکـمـی زیندانکردنی دەدەن. نـازم لە چوروومـەوە بگرە، لە سینۆپەوە بگرە، تا بورسـە، دەکەوێتـە نێو جـەنگە و هـەرەمـەی جـۆربەجـۆری خەڵکی ئەنەدۆڵەوە و لەوێندەر داستانە گەورەکەی ڕەنێو دەهێنێ. من هەمیشـە لەمـــەڕ نازمم گـــوتـووە و دەڵێم: ئەو پیـــاوە دوا ئاڵقـــەی داو و دەســـتـــووری شـاعیرییـەتی یونس عەمرە و قـەرەجە ئۆغـلان و پیرسـوڵتـان ئەبداڵ و داداڵ ئۆغـڵـووە. قـەرەجـە ئۆغـلان کـامـەیە؟ یەکێکە لە ناوچـەرگـەی خـەڵکەکـەیدا هەڵتۆقیوە. پیـرسـوڵتـان ئەبداڵ چییـە؟ لە ناوچـەرگـەی گەلەکـەیدا ڕسکاوە. لەسـەر بارت و ڕەوتی ئایدیۆلۆجیی گەلەکەی هەڵازنیوە. داداڵ ئۆغـڵـوو کێ هەیە؟ کەوڵسووری پێش لەشکری گەلە یاخیبووەکەیەتی. باسـی سـەربزێوی و

لە ناپیاوی ڕاپەڕین دەکا. ئەم هۆزانانە شیعر و گۆرانیی گەلەکەیان پێ گەیاندووە. یۆنس عەمرە چییە؟ دەنگی ئایدیۆلۆجییەکەی خۆیەتی، هۆرەی تەکییەکەی خۆیەتی. ئەمانە سەر و ماڵی گەورەی ئەو جەماوەرە گەورە و گرانەن، ئەمانە هەموو شتێکی ئەو خەڵکە زۆر و زەوەندەیەن. بەنموونە: دادالّ ئۆغلوویک هەموو شتێکی ئەو جەماوەرە گەورە و گرانەیە کە ڕاست بوونەوە و یاخی بوون. پێداویستی، زەرووری بوو دەبوو ببێ. کولتووریانە، گۆرانییانە، زانستیانە، ئەڵها و تاسە و ئاوات و ئارەزوویانە، دەنگیانە. نازم حیکمەتیش کوتومت وایە. لەنێو زیندانەکانی ئەنەدۆڵدا، لە زانستەوە، یا بێ زانست، بەجارێ دەبێ بەهەموو شتێکی کۆمەڵگەکەمان، خەڵکەکەمان. نازم دەبێ بە موتوربەی گەورەی خەڵک، لەناو خەڵکەکەیدا، لەگەڵ خەڵکەکەیدا، پێکەوە، شیعرەکانی، ڕەنێو دەهێنێ. کەوایش بێ، دیارە بلیمەتێکی گەورەمان بۆ لێ هەڵدەکەوێ.

* نازم لە سای بلیمەتیی خەڵکەکەیەوە دەبێ بەو بلیمەتە و بەو تەرزە هەڵدەکەوێ.

– بەڵێ، لە خەڵکەکەی موتوربە دەکرێ. لە سای بلیمەتیی خەڵکەکەیدا دەرسکێ و یەک دەگرێ.

* بەتایبەت بە زمانی خەڵکەکەی.

– ئەی چۆن! بەنموونە: نازم قسەیەکی هەیە، دەڵێ: « ئەم زستانە بێتەوە ڕێوی مس دەڕیێ.» لە ناوچەی چقوورئۆواکەی ئێمە قسەی وا نییە. یانی ئەم زستانە هێند سارد دەبێ، ڕێوی لە تاوان مس دەڕیێ... ئەم قسەیە قسەی ئەنەدۆڵی ناوەندییە. نازم هەر لە ئەستەموولّ مابایەوە، قەت قسەی وا تەرز فێر نەدەبوو.

* قسەیەکی ئابوورییانەی سەیرە. یەکێکە لەو نموونانەی کە بە کەمترین وش پێوارترین ڕەمز داهێنی.

– بەڵام چۆنیش. نازانم قسەیەکی هێند پڕ بە باڵا و بەدەن چەسپ و بنەبڕی تر هەیە سەرماوسۆڵەی ڕۆژانێ زمەهری زستانێ بەو جۆرە دەربڕێ. ئەم قسەیە شێوە دەربڕینی خەڵکێکە ئەزموونی هەزار ساڵی لەگەڵ سەرماوسۆڵەی زستاندا پێکەوە نابێ. ئەمە کەلەپووری قەرەجە ئۆغلانە، کەلەپووری یۆنس عەمرەیە. هەر وا بە سانایی دروست نابێ. بەلای منەوە، ئەدەبیاتی ڕاستەقانیی گەورەی ئەمرۆکەی ئێمە لە نازم حیکمەتەوە دەست پێ دەکا. لەگەڵ لە ئەستەموول دەرچوونی نازم حیکمەت و بوون بە دوا ئاڵقەیەکی گەورەی تازە بەدووی ئەڵقەی داداڵ ئۆغڵوودا، دەست پێ دەکا. چونکە دوو شاعیری گەورەی گەلمان داداڵ ئۆغڵووە، جا نازم ئەو ئاڵقە تازەیەیە، کە وەسەر ئەم دوا ئاڵقەیە خراوە.

* چاکە، ئەدی پاش نازم حیکمەت کێ دێ؟

– پاش ئەوەی کۆمار داهات، ئینسانی تازەبابەت پەیدا بوون. لەو مەعهەدانەی لە گوندەکان دامەزران، لە ناو گوندییەوە، لە خوێندەوارانی پاش کۆمار دروست بوون پیاوی تازە جۆر هەڵدەکەون. ئەمانە زۆربەی زۆریان، بیانەوێ و نەیانەوێ دەبن بە سۆسیالیست، چونکە لە ناوجەرگەی خەڵکی هەژار و دەستەوسانی ئەنەدۆڵەوە هەڵکەوتبوون.

* ناکۆکی و دژایەتییەکانیان دەبینن.

– دەیانبینن. بە خۆیانەوە، بە دەوروبەریانەوە بەندن. بە خۆیانەوە بوونیان هەیە. بەگەلەکەی خۆیانەوە، بە وڵاتەکەیانەوە، بە زمانەکەیانەوە بەندن و هەر بەو جۆرەش دەمێننەوە، هەر لە تەک خەڵکیشدا دەبن. ئەمە ناچارییەکە و دەبێ وا بێ. ڕۆمانووس پەیدا دەبن، چیرۆکنووس هەڵدەکەون، شاعیر پەیدا دەبن. بەنموونە: ئەحمەد عارف لە دیاربەکر هەڵدەکەوێ. ئەم شاعیرە کەڵەکەبووی ئاکامی سەقافەت و کولتوورێکی گەورەیە. ئەحمەد عارف دوا ئاڵقەی پاش نازم حیکمەتە، دوا ئاڵقەی تازەی پاش نازم حیکمەتە. شتێکی

* یانی گۆڕانێکی فیزیکی. (فسیۆلۆجی).

– چووزانم، بنیادەم ببێ بە شتێکی تر، هەر بەجارێ ببێ بە شتێکی زۆر جیاواز ئەوساکە گۆڕانێکی سایکۆلۆجیش ڕوو دەدا واتا: ئەگەر ئینسان بوو بە شتێکی تری جیاواز، نەفسییەتیشی دەگۆڕێ دیارە.

* یانی کە لە ئینسانەتی دەردەچێ.

– بەڵێ، کە لە ئینسانەتی دەردەچێ. کە دەبێ بە شتێکی جیاواز بە نموونە، وەک هەڵۆ بفڕێ، چووزانم..

* یانی لایەنی وا لە ئینساندا هەیە نەگۆڕێ.

– هەیە. بەڵام کلاسیکەکانیش کۆن دەبن. وەک هەموو شتێ چۆن کۆن دەبێ، ئەویش کۆن دەبێ. ئەویش ماوەیەکی خۆی، ئەویش دەوری ژیانێکی خۆی هەیە. بەڵام ئەمە لە گۆڕانی مرۆوە نایە، لەبەر ئەوە نییە، ئینسانەکە گۆڕاوە، لەبەرئەوەیە کلاسیکەکە کۆن بووە، سەردەمی بەسەر چووە، لە بەندوباو کەوتووە.

ئینسان شرۆشکڵێکی جیاواز وەرناگرێ، بگرە دەچێتە نێو بارودۆخێکی ترەوە، دنیاکەی دەگۆڕێ. ئەو کلاسیکانە وایان لێ دێ ئیدی کەڵکی وەڵامدانەوەی مرۆیان بەبەرەوە نامێنێ. بەڵێ سەبارەت بەوە کە کلاسیکەکە لەو بارودۆخەدا ئیدی بە فریای ئینسان ناکەوێ کۆن دەبێ. بەڵام ستاندال وانییە. ستاندال ئیدی ناخوێندرێتەوە، قسەی وا هەڵەیە. بەپێچەوانەوە، ئەمرۆکە ستاندال بگرە زێتر دەخوێندرێتەوە. نەخوێندنەوەی ڕۆمانی درێژ گۆیا لەم چەرخەدا، ئەمەیش هەڵەیە، زۆر هەڵەیە ئەمرۆکە تۆلستۆی سەرژمێرییەکی بۆ بکرێ لە هەموو نووسەرانی دنیا پتر دەخوێندرێتەوە. ئەوەشت لە بیر نەچێ چەرخەکەمان پتر دەخوێنێتەوە. کتێبی گیرفان لە ڕۆژاوا بە میلیۆنان دەفرۆشرێن. هەڵپەی کتێب فرۆشتنێکی بەسام لە دنیادا بەرچاو دەکەوێ. چونکە بنیادەم پتر فێرە خوێندەواری دەبن، بە ژمارەی زۆر

زۆر، وە وەختیشیـان بۆ فەراهەم دەبێ. من لام وایە ماوەی دە ساڵی تەلەڤزیۆن، ئەو هەلپـەیەی مرۆ لە دە ساڵدا بۆ تەلەڤزیۆن تەماشاکردن بە خەرجی دەدا باییی تەواوی ژیانیـەتی. کاتێکی تەلەڤزیۆن هاتە گۆڕێ دەوری پێنج ساڵێ سینەما لە باو کەوت و مرد. بەڵام ئەوەتا ئەوڕۆکە سەرلەنوێ بە ڕمێن و ڕەوا کەوتووەتەوە. پێمان وایە ئێستا رۆمان لە باو کەوتووە. هەرچی تەماشای سینەما دەکا وا دەزانێ. ئەمە هەڵەشەیە. هەرکە تەلەڤزیۆن داکەوت، کتێب فرۆشتن زیادی کرد، هەر وا زیاد دەکا. دە ساڵ لەمەوپێش وەبیر خۆ بێنەوە. ئەو دەمی تەلەڤزیۆن (لە تورکیا - وەرگێڕ) پەیدا نەبووبوو هێشتا، نووسەران کتێبەکانیان لە سێ هەزار بەولاوە زێتر نەدەفرۆشران. کەچی ئێستا تەلەڤزیۆن پەیدا بووە کتێب خۆ لە بیست و پێنج هەزار دەدا لە فرۆشتندا. ئەمە چۆن تەفسیر دەکرێتەوە؟ گۆیا ڕۆمانی درێژ ناخوێندرێتەوە. (بازاڕی ئاسنگەران)ەکەی من شێست و پێنج هەزار، حەفتا و پێنج هەزاری لێ فرۆشرا. لە هەموو ڕۆمانەکەمان بەبرەو ڕمێنتر بوو. ئەمە لە ماوەی چەندیشدا بڵێ؟ لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا، کەچی، (ئەگەر مارەکە بکوژن)م کە کورتترین ڕۆمانمە هەر لەو کاتەدا (بازاڕی ئاسنگەران)ە کەم دەرچوو، ئەویش کەوتە بازاڕەوە، هەر پێنج هەزاری لێ فرۆشرا. (بازاڕی ئاسنگەران)م وا ئێستا لە ئێسوێچ دەردەچێ. دەبینین، بزانن چۆن خۆی لە هەشتا هەزاریش و بەولاتریشەوە دەدا. لام وایە تا سەد هەزاریشی لێ دەفرۆشرێ. ئەوەشت لە بیر نەچێ وڵاتی ئیسوێچ، سەرباریش، ڕەهبەری وڵاتە پیشەسازییەکانە. لە لووتکەدایە. چڵەپۆپەیە. ئەم قسانەی دەیکەین لە بێ بەرپرسیارەتییەوەیە. جۆرە بەرەڵاییەکە. ئەوەت لە بیر نەچێ، تا پیشەسازیی قورس پتر پێش کەوێ، ئامێر و دەزگای جۆربەجۆر تا پتر گەشە بکا، مرۆ هێندەی تر وەخت بۆ پتر پاشەکەوت دەبێ. مرۆ تا دێ پتر دەبێ بەڕۆمان، پتر دەبێ بەشیعر، پتر دەبێ بەمۆسیقا بەڵام هەرکاتێکی گۆڕا، گۆڕانەکەی بە شێوەیەکی بوو، لە ڕووی فیزیکییەوە، لە ئینسانییەتی شۆڕایەوە، ئەوساکە ڕەنگە هەر بەر بەلای ئەم جۆرە شتانەیشەوە نەکا. ئینسان کە خۆی نەگۆڕا، بنیاتی نەگۆڕا

ڕۆمانیش کە پێداویستییەکی ئینسانە ناگۆڕێ، تا ڕۆژێ قیامەتێ ئەرکی خۆی هەر دەبینێ.

یەشار کەمال هەرچەند تا ڕۆژی قیامەت ناژی، بە هەویام تا ڕۆژێ قیامەتێ بخوێندرێیەوە.

١٩٧٧/٧/٢٥

لە کۆواری کاروان ژمارە ٢٥ و ژمارە ٢٦

لە تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٨٤

بە دوو بەش بڵاو بووەتەوە.

# لەبارەی ئەدەب و تەکنۆلۆجیاوە

یەشار کەمال

پرۆفیسۆر دوکتۆر نیکۆلاس کانانۆی ناوێک، بەمەبەستی دانانی کتێبێک بەناوی (ئەدەب و تەکنۆلۆجیا)وە، لە ساڵی ۱۹۷۲دا گفتوگۆی لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە هونەرمەند و نووسەر و ئەدیبە بەناوبانگەکانی دنیا کرد کە یەکێکیشیان یەشار کەمالی نووسەری تورکیایی بوو. وا لێرەدا ئەو پرسیار و وەڵامانە دەکەین بەکوردی کە لەگەڵ یەشار کەمال کراون.

* ڕۆمانی لادێ لە ۱۹۵۰دا ڕچەتان شکاند. لە ڕۆمانەکانتاندا بەزۆری بەلای لادێیی تورکیادا دادەتاشن. مەسەلەی وڵات پیشەسازکردن تا چ ئەندازەیەکی بەپەرۆش خستوون؟

– یەکەم ڕۆماننووس بە بنەچەک لادێیی لە تورکیا منم. بەر لە من، نازمی نەبی زادە، ئەبوبەکر حازمی تەپەیران، یاقووب مەدرسی، قەرە عوسمان ئۆغڵو، سەباحەدین عەلی، ڕۆمان و چیرۆکی لادێیان دەنووسی. ئۆرخان کەمال و کەمال تاهیریش ڕۆمانی لادێیان نووسی، بەڵام ئەمانە هەموو، یا خەڵکی شارە چکۆلەکان یا خەڵکی شارە گەورەکان بوون.

من بۆیەش لە ڕۆمانەکانمدا باسی لادێییان دەکەم، چونکە خۆم بەبنەچەک لادێییم و ماوەیەکی دوور و درێژ، لە گوندەکەی خۆم، لە چقورئۆوا ژیاوم. لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵەمدا، بۆ ئەستەمووڵ هاتم. بووم بە ڕیپۆرتاجنووسێکی ڕۆژنامەیەکی گەورە. کارم ئەوە بوو لە ئەنەدۆڵەوە ڕیپۆرتاج بنووسم. بەشی زۆری دوازدە ساڵ ڕۆژنامەنووسیم، لە ئەنەدۆڵ بەسەرچوو.

چقورئۆوا تەنیا زێدی لەدایکبوون و تێدا گەورەبوونی من نییە، جۆرە زێد و نیشتمانێکی رۆمانەکانیشمە. بەنموونە رەفتاری هەر ئینسانێ، هەر کەسێ رۆمانێکم لە ئەستەموول، لە ئەنقەرە، لە هەر شوێنێکی دنیا، لە رۆماننووسیندا تووش بێ، یەکسەر بۆ چقورئۆوا، بۆ بارودۆخی چقورئۆوا، بۆ ئاووهەوا و دەوروبەری چقورئۆوایان رادەگوێزم. زۆر لەو کەسانەی، زۆر لەو رەوشت و رەفتارانەی، زۆر لەو بارە نەفسییانەی، زۆر لەو گووراندن و خوڵقاندنانەی لە رۆمانەکانمیاندا بەکاریان دێنم، هەر ئەوانە نین کە لە چقورئۆوایان فێر بووم. من چقورئۆوا لە رۆمانەکانمدا سەرلەنوێ دەخوڵقێنمەوە، لە نوێژەنەوە دای دەرێژمەوە. با دووپاتی کەمەوە، باشوورێکی منی تێدا لەدایک بووم، منی تێدا پیرۆکە و وەرووێرکە بووم، باشووری نییە تەنیا هەر منی لێ لەدایک بووبم و هەر منی لێ پێرۆکە و وەرووێرکە بووبم نیشتمانی رۆمانەکانیشمە. ئەوەی من لە رۆماندا خوڵقاندووم و دروستم کردووە، بەلای خۆمەوە رۆمانئاوایەکە بۆ خۆی.

جا بەرانبەر بەوە کە لەوێ وڵاتێکی رۆمان ئاوەدان دەکەمەوە، رۆژ بەرۆژ لەگەڵ هەموو شتێکی چقورئۆوا، لەگەڵ باری ئابووری، نەفسی، کۆمەڵایەتی، لەگەڵ هەموو بارودۆخێکدا ئاشنایەتی پەیدا دەکەم. دیرۆک و جوغرافیای چقورئۆوا لە دیرۆک و جوغرافیای هەموو دنیا چاتر دەزانم. دێ بەدێی چقورئۆوا گەراوم، ئەویش بە پێیان، فۆلکلۆرم خڕ کردەوە، لە فۆلکلۆرم کۆڵییەوە. پێنج ساڵی خشت ئەمە کارم بوو. لە شیوەننامە و بەیت و بالۆرە، لە چیرۆک، لە پەندی پێشینان، لە مەتەڵۆکە، لە سەربەهورد و نوکتە و قسەی خۆشم کۆڵیوەتەوە. هەوەڵ کتێبم، کە لە ١٩٤٣دا بلاو کردەوە ئەو (شیوەننامانە) بوون لە چقورئۆوام کۆ کردبوونەوە و لێم کۆڵیبوونەوە. بارودۆخی گوندایەتی بۆ من، ئەو مرۆوایەتییەیە کە رەوشت و رەفتاری خۆی هەزار ساڵ دەبێ بەرانبەر بەسروشت دەستنیشان کردووە. بارودۆخێکی بەرەگ و بەریشەی نەفسی و کۆمەڵایەتییە.

پەرینەوەی گوندایەتی بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان ئەو رەوشت و رەفتاری

مرۆوایەتییەیە کە ئەمرۆکە، من بەچاترین شێوە بەخەڵکی ئاشنا دەکەم و شایەتیی بۆ دەدەم، لە بەری سروشتەوە بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان پەڕینەوە، بەنموونە، لە زەویی بە گا و ئێستر کێڵانەوە بۆ بەزەوی بەتراکتۆر کێڵان بۆ مرۆوایەتی، بارودۆخێکی تازە و نرت و نوێیە، لە داو و دەستووری کۆن، لە بیر و بڕوای کۆن، لە ڕەوشت و ڕەفتاری کۆن دەست هەڵگرتن، واتە چوونە سەر بارودۆخێکی تر، واتە بیر و بڕوایەکی تر پەسندکردن، واتە بیر و بڕوایەکی تر خستنە کارەوە، واتە لەسەر ڕەوشت و ڕەفتارێکی تر ڕاهاتن، ئەم بارە بەلای منەوە باری هەرە بەپێوەندیی مرۆیە. کە لە بەری سروشتەوە بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان پەڕیوەتەوە. ڕەنگە بۆ یەکەم جار بێ کە بەختەتی درشت لە مێژووی خۆیدا، بەو بنەوەبڕییەوەی لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر باز دەدا. ناڵێم پێیدا دەڕوا، هەر بەڕاستی باز دەدا. ئەم باری بازدانە بۆ ڕۆمانووسێ، تا دوا پلە بەدوای لە کرۆک کۆڵینەوەی نەفسییەتی مرۆدا هەڵوەدا بێ، تا دوا پلە بیەوێ سەرلەبەری توانا و بەهرەی مرۆ بخاتە بەر ڕووناکی، خەریکی ئەوە بێ لە مرۆدا لە نەفسییەتی بێ پایانی مرۆدا ئاسۆی زۆر و زەوەندی تازە بدۆزێتەوە، لە ڕووی سەرنج بزواندنیەوە بارێکی ئێگجار نایابە. جارێ خۆ ئەگەر ئەم بارە، ڕۆمانووسێ، خۆی تێیدا ژیابێ، لە هەوەڵەوە بەهێستر و گاوگۆتاڵ جووتی ڕانیبێ و لە پاشان بەتراکتۆر ملی لە زەوی کێڵان و وەرد و شۆدانەوە نابێ، لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە لە گوند دەرچووبێ و لە کارگە و فابریقە و کارخانەی زەلامدا کاری کردبێ داخۆ...

لادێییەکی بارەو ئاوها هەڵکەوتوو، بەلای منەوە سەرنج بزێوە. نەفسییەتی بارەو ئاوها هەڵکەوتوو لەوپەڕی دەوڵەمەندی و تێکەڵ و پێکەڵی و هەڕەمەییدایە. لادێییەکی وایە کە لە سەدان هەزار ساڵ بەملاوە ئاشنای سروشت بووە و ئێستا لە ناکاو خۆی لە ناو هەل و دەرفەت و بارودۆخی مەکینەدا دەبینێتەوە.

ئینسانانی وڵاتە کەم فراژییەکانی کوتوپڕ خۆیان لە بەرابەر شتی تازە ئیجات، بەزۆری مەکینەی سەیر سەیردا دەبیننەوە. لە ئەوروپا مەکینە

بەکارهێنان هەروەها بەکوتوپڕی سەری هەڵنەداوە، مەودایەکی دوور و درێژی پێ چووە.

هەرچی وڵاتە کەم فراژییەکانن ئەم مەودا درێژەیان بەخۆیانەوە نەدیوە و مرۆ لە ناکاو تووشی بەتووشی مەکینەوە بووە. ئەمەیش لە باری کوتوپڕدا بەرتەکی جۆراوجۆر، ڕەوشت و ڕەفتاری چەشناوچەشن، بۆ هەڵسووڕان و بۆلووانی تەرزاوتەرزی لێ دێتە گۆڕێ. بچی لە ناوەندی دنیایەکی نرت و نوێی وەک دنیای مەکینەدا، کە لە نێو دنیایەکی زۆر کۆندا هەڵتۆقیوە، لەگەڵ مرۆدا پێکەوە ژیان بەسەر ببەی و سەروەت و سامانی بەهرە پێکەوە بنێی، ئەمە بۆ ڕۆمانووسێ بارێکە بەدەست ناکەوێ... دەرفەتێکە لەدەست نادرێ... لەم کارەشدا کرێکار و وەرزێر زۆر گرنگن.

ژیانی بۆرجوا، وردە بۆرجوا، هەر لە کۆندا، لە ئەورووپا چۆن بوو بەچ دەورێکدا ڕۆیشت، لە ڕۆژئاوای وڵاتیش هەر بەو دەورەدا دەڕوا. بۆرجواکان هەر لەخۆڕا، کوتوپڕ دەوڵەمەند دەبن، لە پڕێکدا دەبن بەخاوەن مەکینە، بەڵام کرێکار، وەک لادێیی هەر چۆنێک بێ، ئێگجار وا لەگەڵ مەکینەدا نابن بە یەک ماڵ و دیوار بەدیوار. ئێگجار وا لەگەڵ مەکینەدا بەناچاری نابن بەئاشنا. بەنموونە، دوا ڕۆمانێ، کە بەناوی "ئەفسانەی هەزار کەڵەگایان"ەوەم نووسیوە لەم بابەتە دەدوێ. چقورئۆوا کارخانەی وای تێ کەوتووە، بەم مەکینەی هەرە نوێباوی دنیا ڕازاوەتەوە. ئەمڕۆ برێ لە کارخانەی تەون و جووڵاییەتیی هەرە تازە و هەرە گەورەی تورکیا لە چقورئۆوا دامەزراون. یەکێ لە ئاوبارە هەرە گەورەکانی تورکیا لە چقورئۆوایە. کشتوکێڵ لە چقورئۆوا، خوار و ژوور، هەمووی بەمەکینە دەکرێ. بەڵام بەتەنیشت ئەم هەموو بە مەکینە کارکردنەوە، لە چقورئۆوا هۆز و خێڵی ڕەوەک و ڕەوەندی تورکمان و کوردیش هەن. مەودای نێوان بە مەکینە کارکردن و ڕەوەکایەتی دەبێ مەدوایەکی دوور و درێژی تەواو بێ. ئەم ڕەوەندانە لەوەتەی هەزاران ساڵەوە هەر بەم جۆرە دەژین. زستانان دێنە خواری بۆ چقورئۆوا و هاوینانیش بەرەو چیا و کەژەکانی تۆرۆس هەڵدەکشێن واتا وەک هەموو هۆز و خێڵە کۆچەرەکانی تر

گەرمیان و کوێستان دەکەن.

بەپەز بەخێوکردنەوە خەریکن. بەخوری و شیر و ڕۆنی مەڕ بەڕێوە دەچن. ژیانی خێڵەکی و ڕەوەندایەتی، لە سۆنگەی بارودۆخ گۆڕانی چقورئۆواوە وا خەریکە بەسەر دەچێ. ئەمن بۆ خۆم لەم ساڵانەی دواییدا، لەگەڵ هۆبە تورکمانێکی ڕەوەنددا، کە لە ئاخر و ئۆخری دەور بەسەرچوونیدا بوو ئاشنایەتیم پەیدا کرد. چەندین ساڵ لە زۆرانبازی و کێشەی نێوان داو و دەستووری کۆن و نوێم کۆڵییەوە. ڕۆمانی "ئەفسانەی هەزار کەڵەگایان" لەم لێکۆڵینەوەیە هاتە گۆڕێ. هۆبەیەک کە داغان دەبێ، حاڵی خەڵکەکەی، لە کوێ دەحەوێنەوە، بۆ کوێ دەچن، بەرانبەر بەتورکمانە پاشکەوتووەکان، بەرانبەر بەتورکمانێتیی خۆی، هۆبە چۆن داغان بوو، دەوری بەسەر چوو، ئەمانەم نووسی. بەلای منەوە، تووشی باری نەفسیی تازە و مۆر و شەقڵ نەشکاو بووم. من لەگەڵ ئینسانێکدا کە بەرانبەر بەسروشت هەموو ڕەفتارێکی بەدیار کەوتبێ و ساغ بووبێتەوە چۆن پێوەندی دەگرم و چەند سەرنج دەبزوێنێ، لەگەڵ ئینسانێکیشدا کە بۆ بەری مەکینە بەکارهێنان پەڕیوەتەوە و خەریکە لەگەڵ مەکینەدا سەری داوی سپیی تێ دەکەوێ، بەو ئەندازەیە پێوەندی دەگرم و سەرنجم دەبزوێنێ.

لە دنیا زێدەکردنی هەر خشتێکی نوێ، هەر وەسەرنانێکی نوێ، چ خۆڕسک، چ دەسکرد، دنیا دەوڵەمەندکردنێکە. مەکینەش وەک کردەکانی تری هونەر دەوڵەمەندیەکی دنیایە. دەوڵەمەندیەکی مرۆیە.

* سەبارەت بەگەشە و هەڵدانی تەکنۆلۆجی، ئینسان لە ڕابردووی ئینسانەتی دابڕاوە. بەمە نیگەران نین؟

– ئینسان لە ناوچاوانی تەکنۆلۆجییەوە لە ئینسانەتی دانەبڕاوە. بەلای منەوە، شتێ نییە پێی بگوترێ دابڕانی ئینسان لە ڕابردووی ئینسانانە. مەسەلەکە، مەسەلەی بیانی کەوتن و نامۆیی لێکردنە. ئەمەیش حیکایەتێکی دوور و درێژە. مەسەلەی بیانی کەوتن و نامۆییکردنی مرۆ لە مەکینەوە دەستی

پێ نەکردووە. بیانی کەوتن و نامۆییکردن لە پێشتریشدا هەر هەبووە و لە پاشانیشدا هەر دەبێ. پێم وایە مەسەلەکە هەمووی مەسەلەی خەست و خۆڵبوونەوەی بیانی کەوتن و نامۆییکردنی ئینسانە. هەڵبەتە لەمەدا مەکینە کاری هەرە گەورەی کردووە و هۆی هەرە گەورە ئەوە مەکینە، لەو بارەوەی کە بووە بەهۆی چەوساندنەوە، دەرکەین، ئەم بیانی کەوتن و نامۆکەوتنە بەلای منەوە کەم دەبێتەوە. ئینسان چەند لە سروشتەوە نزیکە ئەوەندەیش لە مەکینە نزیک دەکەوێتەوە. من ئەمەم لەو ئینسانانەدا کە تازە لەگەڵ مەکینەدا رووبەڕوو وەستاون زۆر لە نزیکەوە دیت. هاوپێوەندیی مرۆ لەگەڵ مەکینەدا، ئەگەر مەکینە لە گیانی مرۆ خراپ نەخوێنێ، دەبێتە مایەی هاوپێوەندییەکی زۆر ئینسانانە. ئاشقە مەکینەییەکی زۆر سەیرم لە ئینسانی ئیشکەردا دیت، تەنانەت لەباری ئەمرۆکەشدا.

مرۆ لە ترسان، لە منەتباریيان سروشتی دەپەرست. ئینسانی ئەو چەرخەشمان، بەڕاستی لە هەموو هەل و دەرفەتێکدا منەتباریی خۆی لە ڕاست مەکینە بە ڕاشکاوی دەردەبڕی. سەبارەت بەوە کە مەکینە یەکڕاست دەست مرۆوایەتی نەکەوتووە و چینێکی مرۆچەوسێن داگیری کردووە و لەسەر دەستی ئەو بە گەشە کەوتووە، بووە بە گەورەترین بێ یەغبالی، بگرە لەمێژینەی، مرۆوایەتی. بێتو مەکینە لە دەست ئەم چینە دەرهێندرێ ڕاستەوخۆ بکرێ بەماڵی مرۆوایەتی، هەر برین و جەخارێکی تا ئەمرۆ لە ناوچاوانی مەکینەوە بەر مرۆ کەوتووە سارێژ دەبێتەوە و هەل و دەرفەتی تازە و نرت و نوێشی بۆ دابین دەبێ و دەڕەخسێ. مرۆ کە لە مرۆوایەتی دابڕابێ، وەک بزانین هەقیشێتی، جارێکی تر بە خەست و خۆڵترەوە باوەش بە مرۆوایەتیدا دەکاتەوە و لە بیانی کەوتن و نامۆییکردن خاوێن و پاکژ دەبێتەوە. نەخۆشی و دەردەدارییەکە خۆی هەموو لەوەدایە کە مەکینەیش و سروشتیش بە دەست چینێ ئینسانەوەن و مەکینەکەیش و سروشتییەکەیش و ئینسانەکەیش بە خواست و ئارەزووی ئەم چینە، بێ ئەوەی کەس لێیان بپرسێتەوە لە کار دەکرێن. سەبارەت بەوە کە چینی بۆرجوا سەرتۆپی

ئیمکانات و مەکینە و بەشی هەرە گەورەی مرۆوایەتی، لە کرێکار و وەرزێر و هەروەها سروشتیشی دروست کردووە و دنیا بە دەسەڵاتی سامناکی وی بەڕێوە دەچێ، زۆڵەک کەوتووە و ڕەسەنایەتیی خۆی دۆڕاندووە و بە جارێ بووە بە بیانی و نامۆییی لێ دەکرێ. ئەم چینە نەخۆش و دەغەزارە سەبارەت بە ڕەنگ و ڕووە زگماکەکەی، سەبارەت بەو جۆرە گەشەکردنەی، سەبارەت بەوە کە بووە بە خێوی هەموو ئیمکاناتێ، پشتی لە هەموو بەهای مرۆوایەتی هەڵکردووە و تووشی نیوە شێتییەک بووە. سروشتی بێ پایان و مەکینە و سەرلەبەری ئیمکاناتێکی کە بە دەست چینی بۆرجواوەیە سەرتۆپ شێت و شبری کردوون. ئەو ژیانەیش کە بووە بە ناچاری بۆ چینی بۆرجوا لەم نیوە شێت و شبربوونەیدا دەورێکی گەورەی بینیوە و هەر بە جارێ لە هەموو بەهایەکی مرۆوایەتیی شتووەتەوە. چینی بۆرجوا، لە ڕووی هاتنەگۆڕێی، لە ڕووی بە گەشەکەوتنی، لە ڕووی ژیانییەوە، پشتی لە ڕابردووی ئینسانانەی ئینسانەتی، لە هەموو بەها و نرخێکی ئینسانەتی هەڵکردووە و حاڵی بووە بە حاڵی نیوە شێت. ئەم بیر و ئەندێشانەم دەتوانم بە نموونەیەک بچەسپێنم: شەڕی ڤێتنام بەڵگەی هەرە گەورەی ئەوەیە، کە چینی بۆرجوای ئامریکا تا چ ڕادەیەک نانی هاریی بە دەمەوە گرتبوو و نیوە شێت و شبر بووبوو. بۆرجوای ئەمەریکا زۆر چاک دەزانێ خەڵکی ڤێتنام بۆ پارووە برنجێ بە لاس و پەڵاسدا دەچێ. یەک لەو بەها گەورانەی مرۆوایەتی هێناویە ئەوەیە کە یارمەتیی هاوڕەگەزی خۆی بدا، بەڵێ، ئینسانێکی خوسایی و عادەتی برنج بۆ ئەم ئینسانە برسی و دەستەوسانانە دەنێرێ، وەنییە؟

سەنگ و ڕەنگ و بەهاداریی مرۆوایەتی ئەمەی دەوێ، وەنییە؟ بۆمبا و قومپارە و ژەهری لە ئەقڵ و ئاوەزبەدەر بە سەر و پۆتەلاکی ئەم برا ئینسانە هەژارانەماندا دەبارێن، بە تەکنیکی هەرە پێشکەوت دەیانکوژن. باشە تەکنۆلۆجی و تەکنیک لەمەدا گوناهی چییە؟ لێرەدا ئەوە هەیە. کە تەکنیک دەست چینێکی نیوە شێت و هار کەوتووە.

ئەم تەکنیکە حەواڵەی دەستی ئینسانەتی بکەینەوە هەموو شتێ ڕزگار

دەبێ. چونکە چینێک دەتوانێ بیانی بکەوێ و نامۆییی لێ بکرێ، هار دەبێ. دەبێ بە درندە، پشت لە هەموو بەهایەکی مرۆوایەتی دەکا، بەڵام ئینسانەتی تێکرا، نەبیانی دەکەوێ، نەنەخۆشیش دەکەوێ، نەپشت لە هیچ بەهایەکی ئینسانەتی، خۆی هێنابێتی، هەڵدەکا چونکە هەرچی بەها هەیە، بە سەدان هەزار ساڵ خۆی خوڵقاندوویە، ئەو گەشەی پێ کردووە، ئەو تا ئێرەی بە ئێمە گەیاندووە.

لەسەرێکی ترەوە قسە لە سروشت کوشتن دەکرێ، تەکنیک چۆن خەڵکی ڤێتنام دەکوژێ هەر ئاوهایش سروشت ناکوژێ؟ نموونەیەک بۆ ئەمە دێنمەوە: وڵاتەکەی من، تورکیا ئەمڕۆ لەگەڵ مردن و ژیاندا دەستەوبەرۆک وەستاون. ئەم مردنە نە لە ناوچاوانی تەکنیکەوەیە و نە لە ناوچاوانی هیچ هۆیەکی ترەوەیە. هۆی مردنی وڵاتەکەم، هەموو لە ناوچاوانی بۆرجوای کۆمپرادۆرەوەیە، لە ناوچاوانی بۆرجوای دنیاوەیە. هۆی مەرگ بۆرجوایە. وڵاتی تورکیا، پارچە خاکێکی گەورە و فرەوان، نیوە ئادێنەیەکە. سێ دەریا، دەریایەکی ئەندەروون و چەندین گۆلی هەن. گوێ دەریاکانی تورکیا، سەرلەبەر بە لێرەوار تەندراون. تورکیا، ئەمڕۆ تەنیا ١٠٪ی لێرەوار بوو. لێزانانی زانست وایان دەگوت. هەرێمی تورکیا خۆیشی هەر گیانێکی بەم شریتە لێرەوارە گوێ دەریایانەیە. وا بروا، بەم زووانە، ئەم لێرەواری گوێ دەریایانە، بەرەبەرە دەبڕێنەوە، لە دوارۆژێکی زۆر نزیکدا کار وا بڕوا، تورکیا لە پارچە سەنگجارێکی دنیا بەولاوە هیچی تری لێ بەجێ نامێنێ. ماوەیەکی زۆر کورت لەمەوپێش دەریاکانی تورکیا، بە تایبەت دەریای مەرمەرە، هەریەکە دەبۆیەکی ماسی بوو بۆ خۆی، کەچی ئێستا وا خەریکە ماسی لە دەریاکانماندا بەرەو نەمان دەچێ. هۆی سەرلەبەری مردنی ئەم بەروبووی هەموو خاکە، بەروبووی هەموو لە ئینسانەتی بەدەرەوەیە کە بۆرجوا دای مەزراندووە. بە نموونە: نۆ میلیۆن گوندی لە لێرەوارەکانی تورکیادا دەژین. ئەم نۆ میلیۆن گوندییە خۆیان و بزنەکانیان بە تاقی تەنیا لەم لێرەوارانەدا دەژین.

ئەوەی هەڵی دەتەکێنێ و دەیچینێ هەر لێرەکەیە، ئەوەی هەڵی دەتەکێنێ و دەیفرۆشێ هەر لێرەکەیە، ئەوەی زستان دەیسووتێنێ هەر لێرەکەیە، ئەوەی دەیخوا هەر لێرەکەیە. ئەوەی دەیخواتەوە هەر لێرەکەیە. لەسەرێکی ترەوە شیرکەت و کۆمپانیای زەلام زەلام لێرەوار دەخۆن و دەیانبرنەوە. بۆرجوای کۆمپرادۆر هەر لە پێناوی دەسەڵات وەدەستهێنان و فەرمانڕەواییدا بێ ئەوەی بیر لە دوو ساڵی دوایی بکرێتەوە، چاو لەو هەموو وڵات وێرانکردن و لێرەوار لەناوبردنەی دەستە و دایەرەی سەربەخۆیان دەپۆشن، خەڵکی ناچاری تورکیا و بۆرجوای تورک بەشێکی سروشتی دنیا وێران و خاپوور دەکەن. لەلایەکی ترەوە جۆرە ڕاوەماسییەک لە تورکیا داکەوتووە، سەرلەبەری کان و کانگای ماسی وێران دەکا. بە نموونە: لەم ڕاوەماسییەدا، بۆ یەک تاکە ماسی دە هەزار ماسی لەناو دەبرێ. بۆرجوای کۆمپرادۆری تورک هەقی دەریا کوشتنی بەم سەرمایەدارانەی سەربەخۆی داوە. ئەوەی لە پشت ئەم بۆرجوایەوەیە و دەستی بەسەر فەرمانڕەوایی تورکیادا گرتووە بۆرجوای ئەمەریکایە، خەڵکی تورکیا، کە هەموو ساڵێ لە میلیۆنێ پتر زیاد دەکا و زەوی و خاکەکەی ساڵێ نزیکەی یەک میلیۆن مەتر چوارگۆشە بەداخزان لەناو دەچێ، بەم نزیکانە لەگەڵ برسێتیدا ڕووبەڕوو دەوەستێ. ئەمەیش بە پیشەسازکردنی وڵاتەکە پینە و پەڕۆ ناکرێ و هیچ لە باری مەسەلەکە ڕاست ناکاتەوە. چونکە ئێرانیش هەر وایە و یۆنانستانیش هەر بەو دەردە چووە و هەرچی وڵاتی کەم فراژیی ژێردەستەی بۆرجوای کۆمپرادۆریشە هەر وایە. پێویستە نەتەوە یەکگرتووەکان دەست بەسەر ئەم بارە بەسامەدا بگرێ. سەر زەوی لە وڵاتە کەم فراژییەکانی جیهاندا بەرەنگاری بێ بژێوییەکی بەسام بووە. ئەمەیش خەتای تەکنۆلۆجی نییە، خەتای بیانی کەوتنی تەکنیکە، خەتای ئەوەیە کە تەکنیک دەست بەشێ ئادەمزادی لە ئینسانەتی داشۆراو کەوتووە.

ئەمە چەندین ساڵە من ئەم (ecosid)ە بەسامەی تورکیام لە ریپۆرتاجەکانمدا، لە ڕۆژنامەکەدا دەردەبڕم. ئەمە چەندین ساڵە ئەم (ecosid) لە ڕۆمانێکی پێنج بەرگدا دەنووسم.

* تۆ بڵێی نووسەرێ هەبێ لە وشاری تەکنۆلۆجی ڕزگاری ببێ؟

– وشـاری تەکنـۆلۆجی بۆ نووســەرێ، بۆ ئەم چەرخـەمـان، بابـەتی قـسـە و لێـدوان نـیـیـە. هەرکـەسـێ پێی وابێ تەکنـۆلۆجی وشـار دەکـا، سـامی ڕێ نیـشـتـووە، مـەزنەکردنی تەکنۆلۆجـیبـوون بە وشـار، سـامێکە لە سـەردەمی تۆلسـتۆیەوە بە مـیـرات مـاوەتەوە. تەکنۆلـۆجی، لەبەرئەوەی کە ئەو سـەردەمە هێـشـتـا شـتـێکی نوێبـارتر بووە، بڕێ نووسـەری ترسـاندووە. تەکنـۆلۆجی لە ڕووی دووارۆژی مـرۆڤایەتییەوە، لە پڕ تاخـمێ ئینسـانی نیگەران کردووە. ئەم هەیولا گـەشــەکـردووە لە سـەرەتاوە، هەڵبـەتە ڕووداوێکی بـە سـام بوو لە ڕواڵەتدا. لە سـەرێکیشـەوە بڕوانی، ئەوەی گوتیـان و پێیـان وابوو، بە ڕاست گەڕا. تەکنیک لە جیاتی ئەوەی بێ مرۆ بەختەوەر کا، لە بری ئەوەی جوانترین ڕووپەڕی پێـشکەوتی مـرۆڤایەتی بێ، کەچی ئینسـانی کرد بـە دیل و بەندە و ئینسـان لـە ناوچاوانی تەکنیکەوە تووشی زوڵم و زۆری وا بوو نـەدیتـراوە و نەبیستراوە.

من هیچ وشـارێکی خراپی تەکنیکم بە خۆمەوە نەدیت و نایبینم. تەکنیک بە لای منـەوە، وەک پەرجــووێک، وەک ئەفـســوونێ دەچێ. زۆربـەی خــەڵکیش سـەرەڕای ئـەم هـەمـوو زەرەر و زیانەی لـە تەکنیکیـان دیوە، ئـەوانیش تەکنیک وەک پەرجووێک، وەک ئەفسوونێ دەبینن. بێتو تەکنیک دەست خەڵکەکە کەوێ، تەکنیکیش و نووسـەرانیش و هـونەرمـەندانیش ئازاد دەبن. بیـانی کـەوتن، لە ڕەسـەنایەتی کەوتن، ونکردنی بەهای ئینسـان عونسـووری هەرە گەورەن. ئەو عونسووره هەرە گەورانەن کە کۆسپ و تەگەرە دەخەنە بەر بەهرەی داهێنان و خـوڵقاندنی مرۆ. خەڵک لە تەکنۆلۆجـیی ئازاد بیانی کەوتن، لـە ڕەسـەنایەتی داشۆران، لـە ئینسانەتی دۆڕاندن ئازاد دەبێ. مرۆڤایەتی لە هەموو وشـارێکی کـە کۆسپ دەخــەنە بـەر تاو و گـوڕی خــوڵقـاندن و داهێنان، پاک و خــاوێن دەبێتەوە.

مــەکینـە دەست ئینسـانان بکەوێ هیـچ وشـار و زەرەر و زیانێکی لەســەر

ئینسانەتی نابێ، بە پێچەوانەوە ئادەمیزاد لە زیانی مەنفیی سروشت ڕزگار دەکا. گەزەن و زیانی تەکنیک بۆ مرۆ و سروشت هەر بە تەکنیکەکە خۆی لادەبرێ.

* هەست بە بەرەبەرە پەرەساندنی حاکمییەتیی زانست و تەکنۆلۆجی دەکەن؟

– وشاری زانست و تەکنۆلۆجی، ڕاستەوخۆ نەخەڵک هەستیان پێ دەکا و نەنووسەرانیش. ترس و سام، زۆر و ستەم لە ئینسانەتی بەدەریی زانست و تەکنۆلۆجیای بەردەستی بۆرجوازی ئینسانەتی هەموو کاتێ هەستیان پێ دەکا. ڕکی لە زانستیش و تەکنیکیش دەبێتەوە، زانست و تەکنۆلۆجی کاتێکی دەست مرۆوایەتی دەکەون چ تەنگ و چەڵەمەیەک دێننە پێش مرۆوایەتی ئەوە لە ئێستاکەوە ناتوانین هەڵبێنین. نازانین، لەوانەیە شتێکی لێ هەڵکرێنین. بەلای منەوە، مرۆوایەتی لە سەدان هەزار بەملاوە چۆن لەگەڵ سروشتدا برایانە دەری بردووە، هەر لەگەڵ تەکنۆلۆجیدا، لەگەڵ زانستیشدا برایانەتر دەردەبا و هەڵدەکا. تەکنۆلۆجی و زانست مرۆوایەتی لە هەموو جۆرە بیانی کەوتنێ قوتار دەکا، ئادەمیزاد سەرلەنوێ لەگەڵ خۆیدا، لەگەڵ بەهرەی داهێناندا دەست لەملان و شاد و شوکور دەکاتەوە. زەرەر و زیانی ئەمێستاکەی ئادەمزاد، جەفا و مەینەتییەکی تا ئێستا کێشاویە، لە بەرچاو ناگرین.

* لەبارەی ڕادیۆ و سینەما و تەلەڤزیۆن کار لە ئەدەبیات کردنەوە چ بیر دەکەنەوە؟

– هەر عونسوورێکی تازە دێتە دنیاوە مرۆوایەتییەکەمانی پێ دەوڵەمەند دەبێ، ئەمرۆکە، لەم چەرخە مەنفییەشدا، دەبینین شتی نوێباو تا چ ئەندازەیەک مرۆوایەتیی پێ دەوڵەمەند بووە. سینەما ئەدەبیاتی تەواو پێ دەوڵەمەند بووە، ئاسۆی تازە تازەیی بۆ خستووەتە سەرپشت، هەل و دەرفەتی نوێ نوێی پێ بەخشیوە. ئەو تەکنیکەی، تەکنیکی سینەما بە ڕۆمانی

بەخشیوە لەوانە نییە بە هەل و دەرفەتێکی کەم و بێ پێز بزاندرێ. بێتو تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ دەست مرۆوایەتی بکەون، نەکرێن بە ئامێری سوود و قازانجی چینێک، بۆ پروپاگەندەی چینێ بەکار نەهێندرێن، لە بڵاوبوونەوەی ئەدەبیاتدا بەناو جەماوەری بەربڵاودا دەبن بەهۆی زۆر بەکار. تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ کە ئەو دنیا پان و بەرینەت، دەنگ و ڕەنگەوە لە بەرگوێ و لە بەرچاوان بۆ هەڵدەخەن، سینەما و تەلەڤزیۆن کە تا ڕادەی مانگ پیشاندانیان بۆ ڕەخساندووین، هەروەها بۆ لەدایکبوونی ئەدەبیاتێکی تازە و ڕوختە و ڕاستەقانی، بۆ سنوور و کەوشەن پان و هەراوکردنەوەی، بۆ دەرفەت و ئیمکاناتی نوێ پێ بەخشینی، سوود و کەڵکی زۆری دەبێ.

ئێمە ئاگامان لەوە هەیە کە هەروەک سینەما و ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن پێویستن، کتێبیش، تەنانەت فرۆتنیشی بە ئاکامی بە هونەرەوە گلانی، سەد لە سەد فەرقی کردووە. بەلای منەوە، ئەم تازە کوورە و نوێباوانە، بە پێچەوانەی زۆر کەسەوە، هیچ زیانێ بە ئەدەبیات نابەخشن، لە جیاتی زیان، بگرە سوود و قازانجیان هەیە.

* کەرەستەیەکی زۆری ڕۆمان هێند لە سینەما و تەلەڤزیۆندا دەجوورێنەوە وەختە بڵێم هەر بە جارێ سواون و لە کەڵک کەوتوون... بەلای ئێوەوە تۆ بڵێی، ڕۆژێ بێ، کتێب ئەرکی خۆی بدۆڕێنێ؟

– ڕاستە، سینەما و تەلەڤزیۆن برێ کەرەستەی زۆر کتێبانی کۆن کردووە و گەیاندوونیە ڕادەی سووان و بۆ ئەوە ناشێن جارێکی تر لە کار کرێنەوە. من هیچ کاتێ زیان لەمەدا نابینم. سووان و لە کەڵکی بەکارهێنان کەوتن عەمارەپووبوونی کەرەستەیێ، تا زووە، بەهۆی سینەما و تەلەڤزیۆنەوە لەناوچوونی شتێکی زۆر بە سوود و پیرۆزە بۆ دەوڵەمەندیی مرۆ، بۆ بەهرەی داهێنانی مرۆ. ئەدەبیات لەم ڕوانگەیەوە، هەل و دەرفەتی بەربڵاوتر، تازەتر بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. لەم ساڵانەی دواییدا، کە پێمان وابوو ئەدەبیات بەرەو بوحرانێ دەڕوا، لەمەوە سەری هەڵداوە. ئەدەبیات، هونەر لە ئیمکاناتی تازە،

لە دنیای تازە، لە ئاسۆی نەفسیی تازە، لە زەمانی تازە، لە ڕشت و شێوازی تازە دەگەڕێن بۆ خۆیان. ئەدەبیات لە کەرەستەی نوێ دەگەڕێ بۆ خۆی سینەما و تەلەڤزیۆن کە تەنگیان بە ئەدەبیات هەڵچنیوە و بەرەو ئیمکاناتی تازەی ڕادەدا، بۆ مرۆوایەتی شتێکی زۆر چاک و پیرۆزە. خۆ بێتو ئەدەبیات لەگەڵ سینەما و تەلەڤزیۆندا دەسیاوی و هاوکاری پێک بێنێ، ئەوە بۆ ئەدەبیات خۆیشی و بۆ سینەمایش و بۆ تەلەڤزیۆنیش زۆر بەکەڵک دەبێ. هەرسێ عونسوورەکە کار لێک دەکەن. لە سۆنگەی کار لێککردنی هەرسێ عونسوورەکە، ئیمکانات بەرەو فرەوانی و دەوڵەمەندی وەحەوزەڵ دەکەوێ. سینەما و تەلەڤزیۆن جێگەی کتێب لە ژیانی مرۆدا پتر دەچەسپێنن.

* هێندێ ڕۆماننووسی هاوچەرخ نەخشە و بەرنامەڕێژییان دەلا خستووە و بار و بوخچەی کات و شوێنیان بە جارێ پێچاوەتەوە. ئەمە بەلای ئێوەوە جۆرە هەڵاتنێکە لە ڕاستین و کۆڵ و بارەکانی ژیان، یا تەنیا تەکنیکێکی تازەیە؟

- ڕۆماننووسانی تازەی مرۆوایەتیی جیهانی دەوڵەمەندبووی گەشەکردووی لەگەڵ ئیمکاناتی نوێدا ڕووبەڕوو وەستاون، لە پێناوی ئەوەدا مرۆوایەتیی بەڕاستینە تازەکانی بگا، ناچارن بە لاس و پەلاسدا دەچن. ڕۆماننووس لە دنیایەکی بەم ئەندازەیە بەگەشە کەوتووبێ و هێند دەوڵەمەند بووبێ و گەورە بووبێ و زۆر بووبێتەوە، ناچارە بەشێوەی جۆراوجۆر لە دنیاکەمان و لە ڕاستییەکەمان بگەڕێ. من کات و شوێن پێوەست پێکردنی ڕۆماننووسانی لێشاوی تازە بە هەڵاتن دانانێم. بگرە ئەمە جۆرە ڕەوتێکە بەسەر کۆڵ و باری ژیاندا. لە پاشان کێ ناڵێ ئەم ڕێبازی ڕۆماننووسە تازانە، کە ئێمە بە هەڵاتنی دادەنێین، یا بە نیشانەی هەڵاتنی دەخوێنینەوە ڕەنگدانەوەی ئەو کۆمەڵە نییە تێیدا دەژین، ڕەنگدانەوەی کۆمەڵێ بیانی کەوتەی لە ڕەسەنایەتیی داشۆراوی بۆرجوا و بۆرجوای بچووک نییە. ئەی ئەمە ڕەنگدانەوەی کات و شوێن ونکردنی کۆمەڵە مرۆیەکی لە سروشت دابڕاو، لە مەکینە دابڕاو لە

کۆمەڵگەی ئینسان، بیەوێ و نەیەوێ، دابڕاو نییە، چییە؟ هەڵبەتە هەلاّتنی مێشکیش هەیە، خۆ بە پەنا و پەسێودانی مێشکیش هەیە. لە ڕاستەقانێیتیی ژیان هەلاّتن، لە بارگرانیی ژیان هەلاّتن کارێکی کۆن و دێرینە. یەک لە تاریفەکانی ئینسان ئەوەیە کە گووراوێکی ئەفسانەداهێنە، هەرچی ئەفسانەیشە، خۆ بۆ هەموو سەردەمێ هەر هەلاّتن و سەرخۆهەڵگرتنە. ئەو جێگەیەی لە پاش بێ قیناتی و کۆڵ و باری قورس و گران پەنای پێ دەبرێ ئەفسانەیە. کێ ناڵێ ڕۆمانووسە تازەکان بە بەتاڵکردنەوەی کات و شوێن ئەفسانەی هەلاّتن و سەربەخۆ هەڵگرتنێکی تر هەڵنابەستن و پەنا وەبەر ئەفسانەی بێ کاتی و بێ شوێنی نابەن.

من لە ڕۆمانووسە تازەکاندا بەرانبەر بەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژین توورەییەکی لە چارەبەدەر دەبینم. ڕۆمانی تازە بە بتوونییەوەی، بە تەکنیکیەوەی، بە خوتی خۆیەوەی، بەلای منەوە یاخیبوون و سەرکێشییەکە.

لەم ساڵانەی دواییدا درەوشانەوە و لە پڕ کوژانەوەی ڕۆمانی تازە، نەمان و لە تۆمەری نەمانی ئەوە ناگەیێنێ کە شتێکی دەستکرد و داتاشراوە. من لام وایە ڕۆمانی تازە، ئەوەندەی خوێندوومەوە و لێی دەزانم، دەنگی ناچاری و ناگوزوورییەکە. پێم وایە ڕۆمانی تازە لەم بیست ساڵەی دواییدا کە دادێ، ڕێبازی خۆی دەدۆزێتەوە. من مەزەن ناکەم ئەم هەموو هەوراز و نشێوکردنە، ئەم بەوراز هەڵکشێنە خاوەن کەسانی زۆر بە بەها و ژێهاتییە، سەڵت و قوڵت تەنیا هەر بۆ لە تەکنیک گەڕان بێ. لە ولاّتێکی کەم فراژی کردوودا ناچاری و ناگوزووریی ئەوتۆ هەن، تەنانەت پاڵ بە منیشەوە دەنێن لە سنووری ڕۆمانی لەباو بترازێم. من کە بە جۆرێ لەگەڵ شێوازی ئابووریی تازەدا، لەگەڵ شێوازی کۆمەلاّیەتیی تازەدا، لەگەڵ شێوازی سایکۆلۆجییەتیی تازەدا ڕووبەڕوو دێم، بە تەکنیکە کۆنە لە باوەکان، لەو ئینسانانەی لەگەڵیاندا دەژیم، نادوێم. باشە، ئەمە منێ بەرەو تەکنیکێکی تازە، بەرەو دەربڕینێکی تازە، بەرەو داوودەزگایەکی تازە ناچار بکا، ئەی چی لە ڕۆمانووسی ولاّتە پێشکەوتەکان ناکا. ئەگەر گەشە و پەرەساندنی تازە، ئەو هەل و دەرفەتە

تازانەی بۆ مـرۆ هەڵدەکەون، رۆمـاننووسـان بەرەو ئەوە ڕادەن، لە دنیـای تازە بگەڕێن، ئەوە بۆ ئەدەبیات شتێکە بەدەگمەن هەڵدەکەوێ.

سنووربـەزاندنی رۆمـانی لەباو ناچارییـەکە. دنیـاکـەمـان، هەمـوو ڕۆژێ یا نموونـەی ئینســانی لەبار (ایجـابی) یا نمـوونەی ئینسـانی نالەبار (سلبي) دەخـولقێنـێ. ئەو مـەسـەلانەی لە بەردەم ئینسـانییـەتدا زەق دەبنەوە، هەمـوو ڕۆژێ، بەرەبەرە زیاد دەکەن. خۆ ئیتر کار لەوە ترازاوە هونەر لە تەکنیکێکدا، یا لـە چەند تـەکنیـکدا زیندان بـکرێ. بەلای منـەوە، بەرانبــــەر بـەم تـاوە ســـەرســـووڕێنە لێکۆڵینەوەی ڕۆمـــاننووســـە تازەکـــانیش، تەنانەت سـنوور بەزاندنیشیان هێشتا هەر سست و کزە. دەبوو دەستمـان دابا لێکۆڵینەوەی زۆرتر و جـۆراوجـۆرتر و دەوڵەمـەندتر. من تەنانەت ئـەزمـوون و تاقـیکردنەوەی رۆمـاننووسـە تازەکـان بەکەم و یەکـفـەوا دەبینـم. دەبوو پێمـان لە ئیـمکاناتی تەرزتر داگرتبا. نەک هەر ڕۆماننووسە تازەکان، هەموویان. بەداخەوە هونەری ڕۆمـان مـوحـافـەزەکـارترین هونـەرە. چونکە لـە سـەدا سـەد بە پێـشکەوتنی مـرۆوایەتییـەوە بەندە. هیچ کاتێ وەک تـەکنیک لە نوای مـرۆوایەتییـەوە نـاڕوا. تەنانەت وەک شـێوازیش... من لەبەر ئەمـە ئەگەر کاری ڕۆمـاننووسـە تازەکان بە زۆر تـەرز و زۆر چەشـنیش نەبینم، لێکـۆڵینەوەکـــانیـــان بە کـــەوشـــەن و سنووریش بن، هـەر پیرۆزباییـان لێ دەکەم. ئاواتی هەرە گـەورەم ئەوەیە کـە سەرکەوتنەکانیان گورج و خێرا بەدی بێن.

* لەگـەڵ تەکنیکدا (شـێـواز، بیـچـم، هتـد.) زانسـتـانـە تا چ ڕادەیەک هاوپێوەندن؟

– شـتێکـی ئاشکرایە، شـتێکە زۆر گوتراوە. با منیش بیڵێم. ئینسـانی تازە کـەرەسـتـەی تازە و بیـچمی تازە دێنێتـە گۆڕێ، ئەمـە ناچارییـە، لێ هـەڵاتنی بۆ نیـیـە. مـن وەک وریا و دریایەک لە بیـچـمی نوێ دەگـەڕێم. ئـەو شــتـانەی ڕۆماننووسـانی چـەرخـەکەمـان دایان هێناوە زۆریان لەسـەر دەوەسـتم. بیر لە لێکۆڵینەوەی شێوازە کلاسیکەکانیان، لە جیاوازی و فەرقی شـێوازەکانیان، لە

لێکۆڵینەوەی ڕشت و بیچمەکانیان، لە جیاوازیی بیچمەکانیان، بیر لەمانە هەموو دەکەمەوە. لە پاشان، زۆر لە تایبەتەکانی دەوروبەری خۆم، لە تایبەتیەتیی خۆم دەفکرم. زۆر هەوڵ دەدەم تا دوا پلە لەگەڵ خۆمدا بمێنمەوە و بە خۆمەوە بگیرسێمەوە. بروام بەوەیە کە هەر ئەمە بیچم و شێوازی خوتی خۆم بۆ دەرەخسێنێ. زۆر لەسەر بیچم و شێوەی دەربڕین و قسەکردنی دەوروبەری خۆم ڕادەمێنم و لەسەریان دەوەستم. لە هەرەتی لاوێتیشمدا، وەک پیاوێکی زانا گەلێکم کار لەسەر بیچمی دەربڕین کرد. ئەنەدۆڵ جێگەی چووزەرەکردنی زۆر بیچمە دەربڕینی تەرز و جۆراوجۆر و دەوڵەمەندبوونی فرە قسە ڕەنگینییە. قسەڕەنگینی لە ناو خەڵکی ئەنەدۆڵدا داو و دەستوورێکی گەورە و هەمەچەشنەی هەیە. لە یۆنانستانی کۆنەوە بگرە تا هیندستان، لە فریکی کۆنەوە بگرە تا هیتیت، پاشەڕۆی دەربڕین و داستان و ئەفسانەی زۆر ئاوەدانی (حضارة) ئەمڕۆکە بە ئاشکرا، لە ئەنەدۆڵ دۆزینەوە. وابزانم لە کەلەپووری دەربڕینی وڵاتەکەم گەیشتن، بە بیچم و شێواز گەیشتنی، بیچم و شێواز دەربڕینێکی نوێ بۆ من بەدی دەهێنێ. پێش ئەوەی دەست بە ڕۆماننووسین بکەم خولیای بە دوای بیچمی دەربڕیندا هەڵوەدابوونم تێدا بوو.

* کێهە نووسەر لە هەمووان پتر کاری لە نووسینەکانت کردووە؟

– ژماردنی یەکە بەیەکەی ئەو نووسەرانەی کاریان تێ کردووم کارێکی سەخت و ناهەموارە. ئەوانەی ئێستاکانێ کوتوپڕ بە بیرمدا دێن، دەژمێرم. کتێبی (دۆن کیشۆت) دەسکەلای دەستمە. لە ڕووی بیچمەوە کەڵکم لە ئەلیکساندەر دۆماس فیلس وەرگرتووە. (ئیلیادە) و (ئۆدیسە) ئیرووی وڵاتەکەی خۆمە. وڵاتی من، تا ئێستایش، داوونەریتی داستانبێژیی تێدا دەژی. ئەمە لە ناو تورکمان و کورددا لەم وڵاتە زۆر ئاشکرایە و سێ و دووی لێ ناکرێ(1). تەنانەت تا ئێستایش، نووسەرێکی کە لە هەمووانم پتر بە دڵەوە چووە ستاندالە. چێخۆفیش کاری تێ کردم، ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا کاری تێ کردووم ناڵێم، بەڵام ئەوی هەست بە خزمایەتییەکی نزیکی دەکەم و

حەیرانی بووم فۆڵکنەری ڕۆماننووسە. ڕاستە قاتیچێتییەکەی فۆڵکنەرم بۆ خۆم خۆماڵ کردووە. کە لەگەڵ ژیانێکیدا بە ئەستووری و خەست و خۆڵی تێیدام، بەراورد دەکەم ڕاستە قایچێتییەکەی فۆڵکنەرم لە هی هەمووان بە ڕاستتر دەبینم. ژیان و گوزەران، بروانییە خەڵکی تر، زۆرتر لەوە دەچێ کە فۆڵکنەر دەیڵێ. ئینسانەکانی فۆڵکنەرم زۆر پێ واقیعیتر دێنە پێش چاو، من فۆڵکنەر، وەک هەموو کەس پێی وایە، بەوە نازانم کە وەستایەتی بۆ وەستایەتی دەکا. بەوەی نازانم کە وەستایەتی بۆ ئەوە دەکا پێی بڵێن وەستا. من شێوە دەربڕینی ئەو بەزگماک دەبینم. بە جۆرە هۆمیرۆسێکی دادەنێم. هۆمیرۆس سەردانێکی ئەم چەرخەی کردباین، پێم وایە دەم و دووی وەک دەم و دووی فۆڵکنەر دەبوو. وەک ئەو قسەی دەکرد. بەلای منەوە، هۆمیرۆسیش و فۆڵکنەریش، هەردووکیان لە یەک سەرچاوە ئاو دەخۆنەوە. بە یەک شێواز ڕاز دەر دەبڕن. باری سەرنجی دنیایان زۆر لێک دەچن. لام وایە فۆڵکنەر، نەک هەر ڕۆماننووسی ئەم چەرخەمانە، بگرە داستانبێژی گەورەی ئەم چەرخەیە. لە هەموو ڕووێکەوە... لە دەستم هاتبا ڕێگەی فۆڵکنەرم وەبەر دەگرت، یا ئەگەر زووترم ناسیبا پترم سوود لێ وەردەگرت. وێڕای ئەوەش لە بوونی داستانبێژێکی گەورەی وا لەم چەرخەدا زۆر منەتبارم. دڵشادم. گەزگەز باڵا دەکەم.

* ڕیالیزمی سۆسیالیزم، وەک لێشاوێکی ئەدەبی کاری تێ کردووی؟

– کەم ڕۆماننووس هەیە لەم چەرخەدا ڕیالیزمی سۆشیالیزم کاری تێ نەکردبێ، یا بیری لە ڕیالیزمی سۆسیالیزم نەکردبێتەوە. جا سەقەت بێ، هەڵە بێ، لەبار بێ، نەبێ، ڕیالیزمی سۆسیالیزم بیروباوەڕێکە چەرخەکەمان هێناویە. پێم وا نییە زۆری کار تێ کردبم، بەڵام زۆرم بیر لێ کردەوە. ئەویشم پێ شتێکی دەست هەڵبەست نییە. ئەویش ئیمکانێکە. کام بیر و بڕوا دەگری، کە کۆمەڵ بە وشکەسۆفیەتی دەستەوداوێنی بوو و بەرەو وشکەسۆفیەتی و حەمبەڵیەتی پاڵ پێوە نا، بە دەرخ و لەبەرکردن پێوەی گێژ بوو، ئەوەندەی تر

لایەنە هەڵەکانی لێ ئاشکرا دەبن. ئەگەر هاتوو یاسا و دۆز بوو... خۆ ئەگەر هاتوو بیـــروباوەڕ، وەک دۆز و ڕەچەتە بەســـەر هونەرمـــەندا، بە زۆری زۆردارەکی داسەپێندرا، ئەوە ئەوساکە ورد و باریک دەگاتە نالەباری (سلبية).

* بۆچی هێندە تێکەڵ بە سیاسەت بوون؟

– چەندین ساڵ ئەندامیەتیی کۆمیتەی ناوەندی و سەرۆکایەتیی کۆمیتەی پروپاگەندەی پارتی سۆسیالیستی کرێکارانی تورکیام کرد. ئەم حزبە لە ساڵی ١٩٧٢دا داخرا. بۆ ئەوەی سۆسیالیزم بە جەماوەرانی گەورە و بەربڵاوی خەڵک گەیەنێ ڕەنجێکی زۆر و زەوەندەی بە خەرج دا. هەروەک لەسەرەوەش گوتم، تا تەکنۆلۆجی و مڵکایەتی و فەرمانڕەوایی لە دەست چینی لە ڕەسەنایەتیی داشۆراوی نەخۆشی و بیانی کەوتەدا بمێننەوە، دنیاکەمان لە خراپە ڕزگاری نابێ و حاڵمان لەمە پەرێشانتر دەبێ. جوانترین شتی سەر ئەم دنیایە، کە تیرەی مرۆ ڕەخساندوویە لەناو دەبا. بۆ بەرژەوەندیی تەسک و تروسکی خۆی بەکاریان دێنێ. بۆ کێچێ لێفەیەک دەسووتێنێ. لەبەر شێتی و سەرەڕۆییی خۆی، هەرکە تەنگەتاو دەبێ دنیاکەمان لەناو دەبا. نیشانەی ئەم شێتی و سەرەڕۆییەی، هەموو ڕۆژێ پتر بە دیار دەکەوێ. بۆ ڕزگارکردنی مرۆی چەوساوەی تورکی، بۆ ڕزگارکردنی سروشتی تورکیا، تەنیا هەر هێزی نووسەرایەتی بەش ناکا. نووسەری وڵاتێکی کەم فراژی، نووسەری وڵاتێک کە بە هەموو داراییەکیەوە تووشی بەرەو وێرانبوون، بەرەو خاپوورکران هاتبێ، ناچارە بە کردەوە بچێتە ناو کارەوە. من هەوڵم دا ڕۆماننووسی و سیاسەت، تا حزبەکەم داخرا، یەک بخەم. لەمەوپاشیش کاری سیاسیشم هەر دەبێ. جا بە بەهای چ دەبێ با ببێ. هیـــوادارم تەواوی هونەرمـــەندان، بۆ ئەوەی دنیاکەمان لە تۆڕ و داوی وێرانکارییەک قوتار کەین بە کردەوە بەکار بکەوین. هونەرمەندان بەرانبەر بە هەموو شتێ لەم دنیایەدا، هێشتا زۆر بەکارن. خەڵک هەمیشە حیسابیان بۆ دەکا. حیساب بۆ هێز و توانیان دەکا. حیسابی بۆ شیرینکارییان کردووە و لە ڕێز لێنانیان و کرداردا پلە و پایەی هەرە

سەروویان داونێ. هونەرمەندان لە گۆڕینی جیهاندا، گیان بەسەر دەستەوە، دەبن بە هاریکار و یاریدەری خەڵک. دیارە ئەوانەی بۆ گۆڕینی جیهان تێ هەڵناچن، هونەرەکەشیان ناگۆڕێ. ئەوانەی لە ناخی خۆیاندا باوەڕیان بە گۆڕانی جیهان نییە، بۆ گۆڕینی جیهان بەکار نین و کۆمەگی گۆڕینی ناکەن، لە هونەرەکانیشیاندا گۆڕانی گەورە گەورە بەدی ناهێنن. لەمەوپاش وا دەبێ، چونکە جیهان لە سەردەرانەی تێداچوون، گۆڕاندا وەستاوە.

* ئەرکی ڕۆماننووسێ، هونەرمەندێ لە وڵاتێکی کەم فراژیدا چییە؟

– لە وڵاتێکی کەم فراژیدا بوون بە نووسەر، بە کەڵکی چی دێ؟ ئەم پرسیارەم ساڵانی ساڵ لە خۆم کرد. ماوەیەکی زۆر بڕوام وا بوو کە هونەرمەندایەتی کارێکی لۆکسە و خۆم بە شتێکی بێ بایەخ دەزانی. لە پاشان سارتەریش گوتی، لە وڵاتێکی کەم فراژیدا، پیاو چ ڕۆماننووس بێ، چ فێرکار بێ، وەک یەک وایە. ماوەیەک ئەم بیرە سەرومڕ دای گرتبووم... لە قەڵەم ڕاوەشاندنی ئەو هەموو ساڵەم شەرمەزار بووم. سارتەر هەقی بوو. هونەر چی بۆ ئینسانانی ئازوورده و مەینەت دیدە و برسی و دەسکورت و بێ بژیو دەکرد.. چ سوودێکی دەبوو... ئێگجار بۆ یەکێکی وەک منی بە کردەوە وەخت و کاتی خۆی چۆن بۆ شتێکی بەکارنەهاتووی وا بە خەرج دەدا؟ بەڕاستی ماوەیەک بۆژە بووم. بەڵام کار و کردەوە، پەیدا بوون و خوڵقان بە خۆی هێنامەوە بەو سەرەنجامە گەیشتم کە هونەر بۆ وڵاتێکی کەم فراژیش پێویستە و ئیدی ئۆقرەم هاتێ و ئارامم گرت. ڕۆمان چەند بۆ فەرەنسا پێویستە بۆ ئێمەیش ئەوەندە پێویستە. ئەوەی وەک ڕۆماننووسێ بەسەرم هاتووە، لە زۆر وڵاتی کەم فراژیدا بەسەر هیچ کەسێ نەهاتووە. ئەو هەموو چەرمەسەرییەی حوکمڕانانی تورکیا بەسەریان هێناوم، هەر لەبەرئەوەیە، چونکە نووسەرم. لەبەر ئەوە نییە کە کارێکی سیاسییە بەسەرم هاتووە.

ئەو زوڵم و زۆرە لە مرۆڤایەتی بەدەرەی، بە درێژاییی ژیانێ، لەسەر دەستی حوکمڕانانی تورکیام چێشتووە ناکرێ هەمووی هەڵڕێژم. زۆری دەوێ. ئەم

زوڵم و زۆرەیان هەر تەنیا لەبەر ئەوە لێ کردم، چونکە لەگەڵ گەلەکەمدا یەکم گرت، بووم بە نووسەری. ئەو زوڵم و زۆرەی لەم بیست ساڵەی دواییدا لێم کراوە بێتو رۆژێ لە رۆژان بینووسم، هەر بەراستی ئینسانەتی لە ئینسانەتیی خۆی شەرمەزار دەبێ. ئەوانەی لەم هەشت مانگەی دواییدا بە من کراون، لەو رووەوە کە نووسەرێ لە وڵاتێکی کەم فراژیدا چیی بەسەر دەهێندرێ، سەرنج بزێون. (١) لە مانگی مایسدا بێ پرس و پرسیار گیرام. مانگێ لە ژوورەوە بووم. لە پاشان بێ ئەوەی هیچ بگوترێ بەردرام. (٢) پاش ئەوەی لە زیندان دەرچووم، دوای چەند رۆژێ، هەژدە مانگیان حوکم دام. ئەمەیش هەر لەسەر ئەوەی کتێبێکی ئەمیلە برۆنتیم وەرگێرابوو. (٣) ژنەکەمیان، بێ ئەوەی هیچ وەختێ، بە هیچ رەنگێ، خۆی لە قەرەی کارێکی سیاسی دابێ و تەنیا هەر سەبارەت بەوە رۆمانەکانی کردووم بە ئینگلیزی و ژنی منە، بە سەیر و سەمەرەترین ئیدیعای دنیا و گەر و فزیی نامرۆیانە، چوار مانگیان خستە ژوورێ. مەحکەمەکەی تا ئێستاش هەروا درێژەی هەیە. (٤) رۆمانی (ئینجە مەمەد)م، کە لە تورکیا بە برەوترین رۆمان دادەنرێ و هەر بەرناکەوێ، بڕبڕ، بە رادیۆ بڵاو دەکرایەوە. لە شەشەم رۆژی بڵاوکردنەوەیدا یاساخ کرا. هەر ئەو رۆمانە فیلمی سینەماکەیشی لە تورکیا قەدەغە کرا. بەشێکی زۆری نووسینەکانم کە بۆ سینەما ئامادە دەکران، راگیران. لە کاتی بچووکترین هەرا و بزاوتی خەڵکدا پۆلیس بە هەیت و هووت و خۆپیشاندانێکی سەیر و سەمەرەوە ماڵەکەیان کون بەکون پشکنیم. لەم هەشت مانگەی دواییدا ماڵەکەم سێ جار، کتێب بەکتێب، کون و کەلێن گەڕان. (٥) لە تورکیا هیچ قانوونێ نییە لەمەوپاش داکۆکێ لە من بکا. یاسا و دۆزی چینی فەرمانڕەوای تورکیا، لە هیچ روویەکەوە لە بەرژەوەندیی من نییە، لە تورکیا دەتوانرێ هەموو شتێ لە من بکرێ... ئەمە بە قانوونی ئەو وڵاتە بێ قانوونی نییە. چونکە من نووسەری گەلەکەمم. گوناهم هەبێ نەبێ، هەر کاتێکی ویستیان دەتوانن بمگرن، رەهەندەم کەن، ماڵم بپشکنن... بۆ کردنی ئەمەیش پێویست بە هیچ روخسەتنامەیەک ناکا... ئەمانە هەموو، ئەم

زوڵم و زۆرەی لە من دەکرێ وا دەگەیەنێ کە ئەدەبیات لە وڵاتێکی کەم فراژیدا بە کاری شتێک دێ. ئەدەبیات لەم جۆرە شوێنانە بەکار نەهاتایە، چینی حوکمڕانێک ئێگجار بەو جۆرە دەکەوتنە گیان و وێزەی هونەرمەندێ؟.. قەت یاسا و دۆزی خۆی بەو ڕەنگە پێخوست دەکرد، بۆ زوڵم و زۆرکردن لە ئینسانێ، بۆ ئازار و ئەشکەنجەدانی ئینسانێک خۆی بەم حاڵە دەگەیاند؟ کەواتا ئەدەبیات لە وڵاتێکی کەم فراژیدا زۆر بەکارە. بۆ ئیسپاتی ئەمە، لەوەی بەسەرم هاتووە زۆر دڵشادم، ئێستا زۆرم دڵ خۆشە. کەواتا ئەدەبیاتەکەم بەکار دێ، کەواتا ئەدەبیاتێکی، ڕک و کینەی چینی حوکمڕانم بەم ڕادەیە تووش کا، لە وڵاتێکی کەم فراژیدا زۆر بەکار دێ. ئەو زوڵم و زۆرەی بە من کراوە سارتەریش و منیش بە درۆ دەخاتەوە. لەبەر ئەوە دەبێ پتر خۆ بە ئەدەبیاتەوە هەڵواسین.

١- یەشار کەمال لە وتارێکدا بەناوی (hakasigi) زۆر بە درێژی باسی داستانبێژیی کورد دەکا. لە وتارێکدا کە بە کوردی بڵاو بووەتەوە و لەسەر داستانبێژیی نازم حیکمەت دەدوێ، داستانی گەورەی ئەحمەدی خانیی نەمری بەنموونە هێناوەتەوە لە ئەدەبیاتی کورددا. (وەرگێر)

کاروان، ژمارە ٧ نیسانی ١٩٨٣

# مەسەلە کڕین و فرۆشتنە

عەزیز نەسین

تەلەفۆنیان بۆ دایەرە کرد:

– ئەرێ کاک حەسەن لەوێیە؟

– فەرموون خۆیەتی قسە بکەن.

– زاتی عالیتان؟ ببوورن ناڕەحەتم کردن. بەندەتان.

گەلۆ کە ئەم (زاتی عالیتان) و (بەندەتان)ە دەبیەم، هەر دەڵێی بەلبادم سەر دەبڕن.

– ئەستەغفیرولڵا.

– من خاوەنی کۆواری (هونەرە هەڵبژاردەکان)م.

– زۆر بەجێیە...

– دەمەوێ بتانبینم. نازانم پێتان دەکرێ؟

لە کابرا وابوو منیش یەک لەو عالەمولڵایەم.

– بۆ ناکرێ هەر کاتێ، دەڵێن ئامادەم.

– سبەینێ سەعات چوار لە شەوچەرەخانەی ئایلان یەکتر ببینین؟

– ئەو شوێنە لە کوێیە؟

– ئاوها!!!... نایزانن؟

– نەخێر...

– چەتین یوکسەلی شاعیر، عەلی جەمال، حوسەین کەمالی چیرۆکنووس، خۆ هەموو لەوێ برشیان هەڵێناوە، چۆن نازانی.

بڕیارمان دا سبەینێ سەعات چوار لە شەوچەرەخانەی ئایلان یەکتر ببینین.

هەر ئەو ڕۆژە کاغەزێکیشم بۆ هاتبوو:

«کاک حەسەن کارێکی زۆر گرینگم پێتە، ڕۆژی هەینی چاوەنۆڕتم، تکا دەکەم تەشریف بێنن بۆ ماڵەوە، ئیدی خۆشیتان».

کوڕینە من نووسەرێکی وا نیم کە تەلەفۆن و مەلەفۆنم بۆ بکرێ و لەملا و لەولاوە کاغەزم بۆ بنووسرێ، بەڵام ڕاوەستن، با لە پێشدا خۆمتان پێشکێش بکەم. لە بەژن و باڵادا ناشکوری نەبێ هێندە کورتەبنەم هەر کچێ بمبینێ کوتوپڕ تووشی نەخۆشیی ناهۆمیدی دەبێ، قژم وەکو سەربازی عەجەم نەدەچێتە ڕیز و نەباری خۆی دەگرێ. ڕاستییەکەیتان گەرەکە، ئەگەر کار و پیشەی پیاو بەدەم و چاویدا دیار بێ، لە شاگرد قەسابێکی لاکۆڵانان پتر دەچم نەک نووسەر. هێندە بەتەنگ جلوبەرگیشەوە نایەم. پێم وایە بەرگ هەر ئەوەندەی کە پیاوی مەدەنی بەشوورەییی دەزانی داپۆشێ، لە سەرما و گەرمات بپارێزێ، بەبەرت ڕەحەت بێ بەسە.

سەندەلییەکانم بێ گۆرەوی لە پێ کرد. پانتۆڵە کەتانە چۆک ئاوساوەکەم لە لنگ هەڵکێشا، کراسێکی قۆڵ کورت. ئەفەندی هەی ئەفەندی.

لە ڕێگا تووشی دۆستێک بووم، گوتی:

– لە ئایلان خاوەنی هونەرە هەڵبژاردەکان چاوەڕوانت دەکا.

بەتەمایە وتار بۆ کۆوارەکەی بنووسی، تۆ بڵێی بەسەت لیرەم بۆ بنووسێ.

– منیش بۆ ئەوێ دەچم.

لە ئایلان چوومە ژوورەوە. لەوانەی دانیشتبوون کێهەیان هەو بوو؟

شەیتان بە نەحلەت بی، نەمزانی لە تەلەفۆنەکەدا پێی بڵێم، گوڵەمێخەکێکی سوور، وەکو لە ئیعلانی (بەکاغەز ژن داخوازیکردن)ی ڕۆژنامەکاندا، بە بەرسنگیدا بکا و بیناسمەوە... سەیر دەکەم هەرچی خاوەن کۆواری بێ برەو هەن، لەوانەی هیچیان لە هەزار دانە پتریان لێ نافرۆشرێ لەگەڵ برێ شاعیر

و چیرۆکنووس و هونەرمەندی دەست و پێ سپی کە هیچ کارێکی تریان لە دەس نایێ و پێشیان وایە دەبێ لە سەرانسەری وڵاتدا بناسرێن هەمیشە وەکو جلە کۆن لەوێ کەوتوون. یەکە بەیەکەی شەوچەرەخانەکەم بەچاو بێژا.

– گوتم دەبێ ئەو ڕۆشنبیرەنگە سەرڕووتاوەیە بێ، کە دەستەوارەیەک کتێب و کۆوار لەسەر مێزەکەی ڕیز کراوە و سبیلێ بەدەمیەوەیە.

– ئێوە خاوەنی هونەرە هەڵبژاردەکانن؟

کابرا دەبێ بەبەردەست و مەردەستی شەوچەرەخانەکەی زانیبم، لێم مۆڕ بووەوە.

– منم، چ بووە، چت دەوێ؟

ئارەقێکی شین و مۆرم دەردا.

– هیچ...

– لەسەر تەلەفۆن داوام دەکەن؟

– نەخێر... بڕیار وابوو لێرە بەخزمەت بگەین. من حەسەنم.

– کام حەسەن؟

دەوجا وەرە...

– ئەی دوێنێ بەتەلەفۆن بەخزمەت نەگەیشتین...

– ها!!!، ئەوە ئێوەن؟

ئیدی وەکو بەجارێ بشڵەژێ.

– فە... فە... فەرموون!

جارێ سەیری پێوپلی بێ گۆرەویم دەکا، جارێ لە سەر و قژی بژ و ئاڵۆزکاویم دەنۆڕێ، دیاربوو بەدڵی نەبووم.

– ئەو نووسینانە ئێوە دەیاننووسن؟

– بەڵێ، من دەیاننووسم.

– هەر بەڕاستی ئێوە دەیاننووسن؟

– بەخوا من دەیاننووسم، بەهەزار پێغەمبەر من دەیاننووسم، هەردوو چاوم کوێر بێ...

– بەڕاستی سەیرە...

– لە شەرەف بێ بەری بم من دەیاننووسم.

دەی بەشکو بڵێ «ئەگەر ڕاست دەکەی ئەمە گەز و ئەوە جاو، دە لە پێش چاوم دانەیەکم بۆ بنووسە»!

هەندێ جار دەڵێ: «ئێوە» و دوایی سەیرێکی سەر و سەکوت و شان و شەپێلکم دەکا، بادەداتەوە دەڵێ «تۆ» دووبارە «ئێوە»، نەخێر دیسان «تۆ»...

خۆ لەبارەی نووسین و مووسینەوە ئەوە هەر هیچ و...

– بۆ چتان ویستبووم؟

کابرا هیچ نەبێ بڵێ «زۆرم مەراق بوو، هەروا ویستم بەخزمەت بگەم، حاڵێ حسابێ، خۆشە، کەچی گوتی»:

– من؟ ها، ڕاستە... وانێک... وتارم دەوێ.

کابرا وەکو مەئموری ئیجرا کە بۆ ماڵ حیجزکردن دێ بەو ڕەنگە داوای نووسینی لێ کردم.

– زۆر بەجێیە، با بنووسم.

کابرا لێم ورد بووەوە، ڕووبەڕووم هەر دەیگوت:

– سەیرە... بەڕاستی سەیرە!...

جارێکی تر، گوتمەوە.

– بنووسم.

– من گۆوارەکەم هەفتانەیە، هەفتەی دوو وتارم گەرەکە بەڵام دەبێ وتارەکان لە ڕۆژی خۆیدا و لە کاتی خۆیدا تەسلیم بکەی!

من لەسەر کار گاڵتە و ماڵتەم نایێ. ئەمە یەک...

دواجاریش نابێ نووسینەکانت هەڵە و مەڵەی ئیملای تێدا بێ. دەبێ زۆر

ورد بی!...

– دووەم،

– پاشان خەتەکەشی خۆش خوێن بێ، چاکتر وایە بەتایپ بینووسی.

کابرا لە دۆستەکەی پرسیبووم «تۆ بڵێی بە سەت لیرەی بنووسێ؟»

دیارە بەسەت لیرە کرە دەکا.

هەستایە سەرپێ گوتی:

– کارم هەیە، من دەڕۆم، وتارەکان زوو بێنە!

بەدوعا.

هێشتا نەچووبووینە دەرێ، گوتم:

– بێ زەحمەت باسی پارەمان نەکرد.

– ئاسانە جانم، کێ هەقی تۆ دەخوا. پەسندی کەم وتاری پێنج لیرەت دەدەمێ، بۆت دەست دەدا؟

– وەڵڵاهی زۆر کەمە...

– ئیتر خۆت دەزانی.

– باشە... ڕازیم...

هەر لەوێ دەرچووم، گورج تەلەفۆنێکم بۆ ئەو کابرایەی تر کرد کە بۆ ماڵەوەی بانگ کردبووم:

– کاکە من حەسەنم.

– فەرموون گەورەم.

شەرت بێ داخی کابرای پێشوو بەتۆ بڕێژم.

– کاغەزەکەم وەرگرتن، بەڵام کارم زۆرە و بەداخەوە ئەمڕۆ ناتوانم بێم.

– ئامان سەد ئامان گەورەم، تکا دەکەم.

– ناکرێ!

– کەواتا با بکەوێتە سبەینێ...

– با لە دەفتەری یاداشتەکەم بنوارم... ها...

– سبەینێش نابێ، سەرم زۆر قاڵە.

– دووسبەی؟

– ناتوانم، مەشغوڵم...

– گەورەم ڕۆژنامەیەکی نوێ دەردێنین... تکای وتارنووسینتان لێ دەکەین.

– جا دەبێ من بێمە خاک و پای ئێوە برادەر!

– داوای لێبووردن دەکەین. دەنووسن. نا؟

– دەستم ناگا، ناتوانم.

– دەخیلە گەورەم، هیزە فریامان کەون.

– دەخیل و مەخیل و هیزە و میزە نییە نانووسم.

– چ ئەمر دەفەرموون دەیدەین.

– مەسەلە پارە و مارە نییە، دەستم ناگات، کارم زۆرە.

– گەورەم خاترمان مەشکێنن.

– دەبا جارێ ڕۆژنامەکەتان دەرچێ ببینم.

– کەواتا قوبووڵ دەفەرموون، زۆر سوپاس... من دەزانم ئەوەی ئێوە دەینووسن لە نرخ نایە، بەڵام چونکە تازەین دانەی سەت لیرەتان بۆ حسێب دەکەین باشە؟

– کەمە... من بە سەت لیرە دەست لە قەڵەم نادەم...

– گەورەم، دەست مەنێ بە ڕوومانەوە، با لەسەر سەت و بیست و پێنج پێک بێین.

– دە قەیناکا، ئەویش لەبەر خاتری ئێوە.

بەڵام دەبێ ئەوەندە بزانی کە من لە کاردا گاڵتە و جەفەنگ نازانم. پارەی نووسینەکانم پێشەکی دەوێ.

– بەسەر چاو.

– هەموو ڕۆژێ یەکێ دەنێرییە ماڵەوە، نووسینەکانی دەدەمێ...

– ئەمر دەفەرموون...

– ئیدی هەر هێندە! چاق تەلەفۆنەکەی داخست.

جا ئێستا بۆ دوو جێگە دەنووسم، یەکێکیان بە پێنج لیرە، ئەوی تریان بە سەت و بیست و پێنج لیرە... بە من چی، کێ پارە دەدا، بیدا خۆ من لە هەموو نووسینێک شەست و پێنج لیرەم بۆ دەمێنێتەوە، منیش هەر ئەوەم گەرەکە.

پاشکۆی عێراق، ژمارە ١٩٧٨/٨/٢١

# سفره و خوانی بەربانگگردنەوەی ماڵە مەدەنییەک

عەزیز نەسین

– فەرمووو ئەم ئێوارەیە پێکەوە بەربانگ بکەینەوە.

گوتم:

–رۆژوو ناگرم.

– جانم، جا کاممان ڕۆژووگرین؟

لەمێژە، ئێوارەیەکیان دەعوەتی ئەم زاتەم قوبووڵ کرد و بۆ بەربانگکردنەوە چووم بۆ ماڵیان. هێشتا بۆ بەربانگکردنەوە نیو سەعاتی مابوو، سفرە و خوان داندراوە، بەڵام لە سفرە و خوانی ئارەق و مەزە و شتی وا پتر دەچی. ئارەق، بەفر، میوە، زەڵاتە، ترشیات، بستە و چەرەز، شتی سوورەوەکراو.. کچێکیش دێت و دەچێ، هەر دەڵی جیوەیە، جوان، بزێو، ئیتر مەپرسە. کچە قاچ لەسەر قاچ بەرانبەرم دانیشت، بەڵام وا شڵەژام لە شەرمان هەرچەندم دەکرد نەمدەتوانی ڕووی تێ بکەم. بەدەست خۆت نییە؛ هەرچەند نەشتەوێ، بەڵام چاوە و چی لێ دەکەی کچە پەیتاپەیتا وەکو مەکینە قسەی دەکرد، منیش چاوم لە بنمیچەکە بڕیبوو، گوتم خۆ دەبێ منیش شتێ بڵێم، پرسیم:

– لە کام فێرگە دەخوێنی؟

دایکی هەڵی دایێ:

– گوتمان نەوەک هەڵبێ، هەرکە خوێندنی ناوەندیی تەواو کرد، لە فێرگەمان دەرهانی.

باوکی خەریک بوو پێکم بۆ بکا، نامەخوا کچە وەکو لەشی دەزریاژن بکرێ، زریکاندی:

– ئا ئا ئا، وەڵاهی نابێ، هێشتا تۆپی بەربانگ ئاگر نەدراوە.

پرسیم:

بە ڕۆژوون؟

گوتی:

– نەخێر، بەڵام ئێمە لە حەن داو و دەستووری باو و باپیران یەکجار ملکەچین.

کچی تاین نۆرەی قسەکردنی لە باوکیشی و لە دایکیشی و لە داپیریشی داگیر کردبوو، دەتگوت عەینەمەلە دەخوێنێ، پرسی:

– حەز لە کتێب و متێب دەکەی؟

چت لێ بشارمەوە، کە ئەم پرسیارەی لێ کردم، نەک وەکو لە سەربان بکەومە خوارێ، بگرە وەکو لە سەربانەوە میز بەخۆمدا بکەم، پەشۆکام.

گوتم:

– حەزی لێ دەکەم.

کچە وەک زەمبەلەک ڕاپەڕی، کتێبێکی لە ئەتاژێرەکە دەرهانی و بۆی درێژ کردم و گوتی:

– ئەم کتێبەتان خوێندووەتەوە؟

کە سەیری کتێب دەکەم (ژیانی جنسیمان)ە.

بە باوکیم گوت:

– ماشەڵا کچەکەتان زۆری حەز لە خوێندنەوەیە.

دایکی هەڵی دایێ:

– گوتمان نەوەک ڕابکا، ئیتر بۆ فێرگەمان نەنارد، بەڵام مامۆستای تایبەتمان بۆ ڕاگرت، لە ماڵەوە فێرمان کرد.

تۆپ ئاگر درا، لە دەوری سفرە و خوانی بەربانگ (!) ئاڵقەمان بەست. کچە پێکی بۆ هەمووومان کرد و خۆی لە پێش هەمووانەوە پێکەکەی هەڵگرت و

گوتی:

– بەخێر بێن!

هەریەکە پێکی خۆمان هەڵدا. دایکی گوتی:

– گوتمان نەوەک هەڵبێ، نەمهێشت هێندەی بستێکم لێ دوور کەوێتەوە.

– مەزە نافەرموون؟

دایکی دەیویست پتری روون بکاتەوە:

– گوتمان نەبادا هەڵبێ و شتێکی لێ بقەومێ.. باوکی خۆی تێ هەڵکێشا و لەسەر قسەکانی دایکی رۆیشت و گوتی:

– بۆ دەرەوەی زۆر نانێرین...

– جەناب، کچەکەم...

باوکی:

– بۆ ئەوەی رانەکا و لەگەڵ بێگانە و مێگاناندا..

دایکی:

– رێگەی گەران و ئەملا و ئەولای نادەم...

باوکەش و دایکەش و کچەش وا دیاربوو خواردنەوەکەیان لە سنوور ترازاندبوو و دەیانبزرکاند:

– تۆ عەشقی خوا ئەگەر لە مەزەکان نافەرمووی، بەربانگکردنەوەیە بێ بەڵا بی!

کچە قەوانێکی هەوا و ئاوازی سەما و دانسی بە شیر و هۆری خستە سەر پیکاپەکەیان...

دایکی:

– گوتمان نەوەک هەڵێ و لە دەرەوە دانس و مانس بکا...

باوکی:

– ئەرێ، قەت رێگەی شتی وای دەدەین؛ تا ئێستا بۆچی رۆژێ لە رۆژان

خوانەخواستە... نامووس وەکو هیچی تر نییە برادەر، زۆر ناسکە... ئەوە بۆ ناخۆیتەوە...

باوکە لەسەر کورسییەکەی پان بووەوە و دەستی بە پرخ و هۆڕ کرد. ئیتر درەنگ بوو. کە دوعاخوازیم لێ کردن، کابرایان بەزۆر لە خەو ڕاپەڕاند.

– سبەی ئێوارەش هەر لە ماڵی خۆمان بەربانگ دەکەینەوە...

دایکی گوتی:

– کچم میوانەکە بەڕێ کە، تا ئێستگەی پاسەکانی بەرە.

بەرێکی بەلای منیشەوە کرد و گوتی:

– لەگەڵ بێگانە و مێگاناندا قوبووڵ ناکەم، بەڵام جەنابت بە بێگانە نازانین.

باوکی بەدەم و فلّتی سەرخۆشانەیەوە قیڕاندی:

– یەعنی چی، بۆ تا ئێستا لەگەڵ هیچ بێگانەکەیدا... خوامە و خوا...

نۆرەی قسەکردنیان لێ تەنی بووم، سا هەرچۆنێ بوو، هەلم بۆ هەڵکەوت. گوتم:

– ببوورن، با لەمە زیاتر هەڵنەیەین و پێی لێ هەڵنەبڕین، من بە تەنیا دەڕۆم، ڕێگەکە شارەزام. بەخواتان دەسپێرم.

ڕۆژی کوردستان، ژمارە ٢٧ حوزەیرانی ١٩٧٥